# ئەدەب و سیاسەت

چەند وتارێکی ئەدەبی و سیاسی

وەرگێڕانی

مەهدی سالح

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **ئەدەب و سیاسەت**

**(چەند وتارێکی ئەدەبی و سیاسیی)**

● بابەت: وتار

● وەرگێرانی: مەهدی سالح

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران ڕەواندزی

● بەرگ: ڕێمان

● ژمارەی سپاردن: (١٠٠٧) لە ساڵی ٢٠١١

● نرخ: (٢٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم ٢٠١٣

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٧٩٦)

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ئایا نوسین جۆرەکە لەشێتایەتی ؟

نووسین دەروازەیەکی پان وبەرین لەبواری جموجۆڵی مرۆڤی ئەم سەردەمە پێکدێت لێرەدا لێکۆلینەوەکە دەربارەی رۆمان و شانۆیە ، بەڵام مەرج نییە راوبۆچونی نووسەر رەها بێت بەڵکو دیدەکانی خۆی دەخاتە روو لەم بارەیەوە ، پێش ئەوەی بچێتە نێو باسەکە زانای دەروونناسی (سیمۆند فریدۆ) جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە (منی باڵا) یان ویژدان لای نووسەران و هونەرمەندان لاوازو کزە... لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی تازە لەلایەن زانایەکی ئەمەریکی بەنێوی دکتۆر (فیلیکس بۆست) لەم چەند مانگەی رابردوودا بەدیار کەوت جەخت لەمەڕ شێتایەتی نووسەرانی رۆمان و شانۆکان دەکات کە روویان کردۆتە لایەنی تلیاك کێشان و شێت بوون و خۆکوشتن و کزی پەیوەندیان لەگەڵ جیهانی دەرەوە ، کەچی ئەم رێژەیە بەلایەن شاعیرانەوە وانییە، بەڵکو زۆربەیان هاوسەنگییەکی باشیان لەنێوان بواری ئەقڵ و وەزیفەی کۆمەڵایەتی پەیداکردووە هەمیشە بەردەوامن بۆ پاراستنی ئەم پەیوەندیە. زانای ئەمەریکی دکتۆرێکی دەروونییە لەلێکۆلینەوەکەیدا ١٠٠ نووسەری ئەمەریکی و بەریتانی هەڵبژاردووە بۆ ئەم مەبەستە بەڕای خۆشی پەیوەندیەك لەنێوان داهێنانی نووسین و

تێکچوونی شێرازەی ئەقڵ هەیە . جێی باسە ئەم زانایە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر نوسەرە مردووەکان کردووە بۆ ئەوەی تووشی ژانە سەر نەبێت و کاری دژایەتی رووبەرووی نەبێتەوە ، لەم بارەیەوە دەڵێ، ئەو هەوڵ و کۆششەی نووسەر تووشی گۆشەگیری و ماندووبونێکی زۆر دەکات لەپێناوی هەڵبژاردنی بابەتێك بۆ ئەوەی داهێنانە دەبتە هۆی گۆرانکاریەك لەدەمارەکانی مێشك بەواتایەك شێتایەتی لەنووسین شتێکی ئاسایییە وەك ئەو یاریزانەی لەکاتی تۆپی پێدا دەست و قاچیان دەشکێت لێرەدا چەند پرسیارێك سەر هەڵدەدا لەوانە ئایا نووسین پاککردنەوەیە یاخود شتێکە بۆ ئەوەی بابەتەکان لەبیر بکرێن یان پردێکە بۆ دروست بوونی کێشمەکێشیەك ؟ کەروو بەرووی نووسەر دەبنەوە ، ئایا ئەمانەش پێویستن بۆ خەونەکانی رۆمانتیکمان کەراستیەکن و پەیوەندی تەواویان بەخودی نووسەرو بونیەوە هەیە؟ زۆر لەزانایان دوای ساڵانێکی زۆر لە دەرکردنی هاوکێشیەکی زانستی و سەرکەوتن بەدینا هێنن ، کەچی نەمان زانیوە زانایەك لەم بارەیەوە لەواقیع رابکات و روو لەتلیاك کێشان و خواردنەوەو خۆکوشتن بکاتەوە......ئایا ئەمەشیان پەیوەستە بەکاروباری زاماکان و بارودۆخی کۆمەڵایەتیان ؟ کە زۆر پێچەوانەی هەیە لەگەڵ نووسەرێك هەست بەتەنیایی و خودی خۆی دەکات ....یان ئەم جۆرە کارەش پەیوەندی بەشێوازی دەرونی و جولانەوەی نووسەر هەیە؟ لەڕوانگەی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەندێ لەنووسەرانی بەریتانی وتیان شیعر زۆر ئاسانترە

لەرۆمان — رۆماننووسیش هەر بۆ خۆی نیوە شێتیەکە بۆ ئەوەی بتوانێ ماندووبونێك بچێژی بەو شێوەیەی نووسینەکەی پێویستیەتی ، بەڵام هەندێکی تریان گاڵتەیان بە (تیۆری) شێتی نووسەر دیچت و لایان وایە وایە پاشکۆیەکی ئەدەبیە ئاماژەیان بۆ ئەو رۆمانە کرد کە زۆر بەر بڵاون وەکو شتێکی ئاسایی و خاوەنەکانیشیان مرۆڤی ئاسایی بوونە. لەکۆتاییدا دەڵێین هەندێ لەنووسەران لەهەڵسوکەوتیان ئاسایی نین ئەمەشیان دەگەرێتەوە بۆ کاریگەری خودی نووسەرەکە خۆی و دەوروبەرەکەی بۆ ئەوەی بەم شێوەیە رەفتار لەگەڵ زۆرشتدا ئەنجام بدات.

## بلزاك و كۆميدياى مرۆڤايەتى

فريدريك ئەنگلس دەربارەى ئەدەبى (بلزاك) و گرنگيەكەى دەڵێ —( ماركس) شانازى بەكۆميدياى مرۆڤايەتى دەكرد، ئەو كارە ئەدەبيەى ڕەنگدانەوەو باس لەقۆناغێكى مێژويى تەواو دەكات لەم رۆمانە زانيياريیەكى زۆرم وەرگرت كە بارتەقاى كارى هەموو مێژوونووسان و ئابورىناسانى ئەو سەردەمە بوو. (هاينريش هاينە) ى شاعيرى ئەڵمانى هەر لەسەرەتاوە بايەخێكى زۆرى بەئەدەبى (بلزاك) داوە. (ڤيكتۆر هۆگۆ )ى رۆمانوسى فەرەنسى لەكاتى بەخاك سپاردنى (بلزاك) گوتى ئەگەر ڕازى بێت ياخوود نارازى بێت دانەرى ئەم كارە ئەدەبييە سەر بەنووسەرە شۆرشگێرەكانە. .. هەروا (بليسخانۆڤ) ى ئابورىناسى رووسى پێى وايە ئەو نووسەرانەى لەدواى (بلزاك) هاتوون ئەو منداڵانە نەبون كە شايستەى باوكيان بن، (تۆڵستۆى) ئاماژەى بەوەداوە كە لەرێگاى بلزاكەوە فێرى نووسين بووە.... (مەكسيم گۆركى) يش دەڵێ بلزاك لە رۆمانسييەتە شڵە شاوەكەى رزگارى كردوە.

لێرەدا بابزانين ئەو نووسەرە كێيیە كەهەموويان ستايشى ئەم كارە ئەدەبييەى دەكەن(بلزاك) لەپێشەكى رۆمانەكەيدا (دەڵێ) لەسەر بناغەى دوو كۆڵەگەى ڕاستيدا دەنووسم كەئايين و موڵكدارى ڕەهايە...بەڵام نووسەر خاوەن سۆزێكى نيگەران و زانايەكى كۆمەڵناسى ساكار بووە و باوەرى بەخۆشەويستى نەبوەو بەبەردەوامى بيرى لەهێننەدى خەونێك دەكردەوە ئەويشيان ببێتە خاوەن موڵك. وێراى ئەمەش دەبێ لەبەرچى ئەو

هەموو نووسەرە ستایش و شانازی بە بلزاك دەكەن ؟ كەباوەری تەواوی بەمولكداری رەها و كلێسە هەبووە. ئەنگس پێی وایە نووسەری كۆمیدیای مرۆڤایەتی ئۆرستۆكراتیەكەیخۆی ریسوا كردووە ئەمەشیان گەورەترین سەركەوتنی واقیعە. بلزاك لەرێگای نووسینەكانیدا هەوڵی داوە وەك زانایەك دیاردەیەكی دیاریكراو بەشێوەیەكی وورد وەسف بكات یاخوود ویستویەتی زانایەكی سروشتی رۆمان بێت ین تەكانی نووسینی فەلسەفەی سروشتی كۆمەڵگا بدات... لەشوێنێكی تردا (دەڵێ) ئەگەر كۆمەڵگای فەرەنسی نووسەری مێژوو بێت ئەوا من دەبم بەسكرتێرەكەی... نووسەر بایەخێكی ئەتۆ بەخۆی نادا بۆ ئەوەی وەك نووسەرێكی ئەدەبی بەدیار بكەوێت جارێكیان ڕەشنووسی ڕۆمانی (پزیشكی گوندەكە) ی بۆ لای خوشكەكەی لۆرد سۆرفیل ڕەوانە دەكات بەو مەبەستەی كاری زمانەوانی بۆ راست بكاتەوە و نووسییەتی (ئەگەر بكرێت دوو ڕستە لەیەك ڕستەدا كۆبكەیتەوە تكام وایە هەوڵ بدەی سەر لەنوێ پێكهاتەی ڕستەكان بنوسیتەوە) .... بلزاك پێی وایە بەهرەو ڕەسەنایەتی هیچ بەهایەكی ڕاستیان نییە ، بەڵكو دڵسۆزی بۆ واقیع و چوونە بنج وبناوانی بەشێوەیەكی زانستی راستیەكە دەسەلمێنێ...هەروەها لەپێشەكی ڕۆمانەكەیدا دەڵێ پێویستە یاسای جموجۆڵ و ڕێرەوی هەر كۆمەڵگایەك لەنێو خۆیدا سەرهەڵبدا.

خۆشەویستی لەرۆمانی (کۆمیدیای مرۆڤایەتی) جێگای خۆی کردۆتەوە، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی بلزاك لەرۆمانەکەیدا ژمارەیکی کەم لەئەڤیندارەکان دەخاتە روو.

کەسایەتیەکانی نێو رۆمانەکە دەبەنگ و مەکر بازن ناتوانرێ بەشێوەیەکی ئاسان شارەزایان بین، ئەمەشیان بۆ خودی بیروباوەری نووسەر دەگەرێتەوە(بلزاك) لەساڵی ١٨٣٢ نووسیی‌تی (ئایا ئایین بەهێزترین ئامرازی حوکم نییە بۆ تێگەیشتنی گەل بۆ ئەوەی بەدرێژایی ژیان لەخۆراگری ئازارەکان و کارە سەختەکانی بگات )... لەم روانگەوە بایەخێکی گەورە بەئایین و رۆڵی کۆمەڵایەتی کڵێسە دەدات...

(کۆمیدیای مرۆڤایەتی) بەرهەمی نووسەرێکی رۆماننوسی نییە، بەڵکو کاری زانایەکی ماددیە، سەرجەم هێماو ناماقووڵییەکان بەلاوە دەنێت، و بابەتی خۆشەویستی و باوەرهێنان و بلیمەتی هەروەکوو خۆی دەخاتە روو. زۆرجار بەوردی دیاردەی کۆمەڵایەتیەکان و چارەنووسی خەڵکەکەی کە سەر بەچینی جیاوازن ئەوانەی لەشار یان لەلادێ دەژین وەسف دەکات...

بلزاك نووسەرێکە بۆ مێژوو یخود مێژوونووسی کۆمەڵگا دەبێ بخرێتە پاڵ ئەم نووسەرەو بەهەموو رێگایەکیش هەوڵ دەدات ئەم کارە بسەلمێنێ....

(بلزاك) رای وایە — نووسەری رۆمان دەبێ هەندێ ئامرازی هونەری بەکاربێنێ ، ئەمەشیان مافێکی سروشتی خۆیەتی ، سروشت بەبەردەوامی

لەو داهێنەرترە، هەروا سروشت چیرۆکەکەی بەرادەیەك ڕاستییەك کردۆتە بناغە و چۆنی دیتووەو هەستی پێکردووە دەیانخاتە ڕوو، ڕووداوەکان و کەسایەتیەکانی بەرهەم هێناوە و هەموو شتێکیش دەزانیٚ و خاوەن بەڵگەنامەیمێژووییە، ئەگەر ناچار بکرێت پشتیان پیٚ دەبەستیٚ، هەرچەندە لەهەندیٚ جاردا تەواو نین- بەم هۆیەوە پەنا بۆ ئەگەرەکان دەبات — ئا بەم شێوەیە ڕۆماننوس وەك نووسەرێکی مێژوو هەوڵ دەدا هەندیٚ وشە بۆ رونکردنەوەی رووداوەکان بەکاربێنیٚ....

زۆربەی کەسایەتیەکانی (بلزاك) دەگەرێنەوە بۆ بەهرەو بلیمەتی خۆی، بەرۆحیەتێکی فراوانی نزیك لەشێتایەتی ڕۆمانەکانی دەنووسیتەوە، بەو مەرجەی دەوڵەمەند بێت. بەدرێژایی ژیانی لایەنە بەسوودەکانی کارەکەی هەڵسەنگاند ، جارێکیان لەگەڵ ئەو کەسەی کە رۆمانەکانی بلاودەکردەوە کەوتە گفتوگۆ پاشان گووتی لەماوەی سەعاتێکدا باسی هەندیٚ بابەت دەکەین، کەسوودی نییە بۆیە دووسەد فرەنکم زەرەرکرد...

زۆرجاران(بلزاك) بیری لەوە دەکردەوە کەواز لەئەدەب بێنیٚ و ڕوو بکاتە کارێکی تر ، کە قازانجی زێتر بکات لەرووی ئابووریەوە ، هیچ ڕۆماننوسێکی سەردەمی خۆی یان ڕۆماننوسانی ئێستا وەك ئەو شارەزای لایەنی ئابوری نەبوون... لەماوەی ژیانیدا چاپخانەیەك وکارگەیەکی بچوکی کری بەو مەبەستەی بەخۆی بەرهەمەکانی چاپ بکات. و بلاویان بکاتەوە . دەرهێنانی کانزا لەکانەکان کردارێکی گرنگ و بایەخدارە(بلزاك) رووی کدە (سقلیە) ی ئیتالیا بۆ کرینی کانەکانی زیو، بەلام بەهۆی

کەمتەرخەمی بەر لەگەیشتنی یەکێکی تر مافی دەرهێنانی ئەو کانانەی کریبوو... لێرەدا دەبی ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو کانانە خەڵکانێکی زۆری دەوڵەمەند کرد، هەروەها ئەو ئەوکاتەی لەئۆکرانیا بووە لەرێگای نامەکانیدا بەدیار کەوتووەکە(بلزاك) بیری لەوە کردۆتەوە کە داری بیناسازی لەم وڵاتە زۆر هەرزانەو ئەگەر ڕەوانەی فەرەنسا بکرێت و بفرۆشێتە کۆمپانیاکان بەمەبەستی بەکارهێنانی بۆ هێلەکانی شەمەندەفەر قازانجێکی گەورە بەدەست دەهێنیێ، بەم شێوەیە ئاماری ئەو ساڵانە بەدیار دەخەن کە فەرەنسا برێکی زۆری لەم دارانە لەرووسیاوە کڕیوە...ئەمەشیان بەڵگەیەکی تەواوە کە نووسەر شارەزایی لەبواری ئابوریدا هەبوە، هەرچەندە رەخنەگرانی سەردەمەکەی بەلێزانی دڵی ئافرەتیان ناوبردووە... (بلزاك) بەهیچ شێوەیەك خەیالی نەبووە ، بەشانازییەوە دەیگوت (ئەوەی پابەندی بیروراکانی من بێت دەتوانێ موڵکدارییەکی بچووك پێك بێنێ) هەروا کارو کردەوەکانیشی لەشێوەی خەیاڵ و ئارەزووی ناوداری نەبووە، بەڵکو هەمان هێزو توانای کۆمەڵگەی بۆ رژوا بووە.

ئەویشیان پەیوەستە بەخۆشەویستی و کۆکردنەوەی پارە... بەم هۆیەوە (بلزاك) بۆتە خاوەنی چاپخانەو لەبوارەکانی ڕۆمان و ڕۆژنامەو نووسینی شانۆ و گەڕان بەدوای زێڕو ڕەخنەگرو ئەندامێتی پەرلەمان کاری کردووە، ئایا کەسایەتییەکانی نێو رۆمانەکانی (بلزاك و ستانداڵ) و ڕۆماننووسەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەنێو ڕۆمانەکانی ئێستادا بەدی دەکرێن؟

## ئانا زیگر و دوو چیرۆکی زۆر کورت

ئانا زیگرز لەساڵی ١٩٠٠ لە شاری ماینس لەدایك بووە، لەبەر کارە ئەدەبیە بەپێزەکانی بەگەورەترین ئەدەبی ئەم سەدەیە دەژمێردرێ ، لەساڵی ١٩٢٨ خەڵاتی کلایستی لەمەڕ یەکەم کتێبی کە رۆمانێکە لەژێر ناونیشانی راپەرینی راوچیەکانی ماسی وەرگرت، هەروەها لەساڵی ١٩٤٧ یش خەڵاتی (جۆرج یوشنەر) ی سەبارەت بەرۆمانێکی تری بەناوی (خاچی حەوتەم ) بەدەست هێنا، ئەم کتێبەی بۆ یەکەم جار لەدەرەوەی وڵات بڵاوکرایەوە بەم هۆیەش ناوبانگێکی جیهانی پەیدا کرد. لەساڵی ١٩٣٣ دا ئانا بەرەو فەرەنسا کۆچی کردو لەساڵی ١٩٤١ یش لەمەکسیك گیرسایەوە . بەڵام لەساڵی ١٩٤٧ دا گەرایەوە ئەڵمانیا و لەبەرلینی پایتەختی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی پێشوو نیشتەجێ بوو ئانا وەك رۆماننوسێك و نووسەری چیرۆکی کورت ناسراوە لەدوایین ژیانیدا کرا بەسەرۆکی یەکێتی ئەدیبانی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی پێشوو لەناوەڕاستی هەشتاکان کۆچی دوایی کرد ئەمانەی خوارەوەش نموونەیەکن لەچیرۆکە کورتەکانی:-

میتینای بۆخارست ئەو کاتەی کچێکی بچوك بووم لەنوستندا گوێم لەزیرەی دەرگاو پستە پستێك لەتاریکی بوو کەچی بۆ جارێکی تر خەوم لێ کەوتەوە. بۆ بەیانی پرسیارم کرد، ئەوە کێ بوو؟ باوکم وتی تۆخەونت دەبینی ،بەڵام لام سەیر بوو دایکم لەبەیانی زوو وەرە ماڵەکەی خاوێنکردبۆوە ، چونکە وەك نەریتێك دوای ئەوەی باوکم

بەرەو کاردەرۆیشت ئەم کارەی ئەنجام دەدا پاش ئەوەی دایکم بەرو بازاڕ ڕۆیشت لەژێر ئەستیلکی شۆردن دەستە سرێکی لوولدراوم دۆزیەوە لەخوێن وەردرابوو لەو باوەڕەدابوم ئەوان راستیان بەمن نەوتوە لەبەر ئەمە چاوەڕوانی دایکمم کرد بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم . دایکم بەتەنها نەگەرایەوە ، بەڵکو بەیاوەری دوو پۆلیس هاتنە ژوورەکەمان و وتیان:- هەڵمان مەخەڵەتێنن لێرە لەم ماڵە خۆی شاردەوە دایکم وتی : مادامەکی ئاگادارن بەدوایدا بگەرێن.... . ئاگاداری باسەکە بووم لەبەر ئەوە بەپێم دەستە سرەکەم تووڕەدایە نێو تەنەکەی پیساییەکان و پاشان دوو پۆلیسەکە لەماڵی ئێمەوە تا دەگاتە دراوسێکان دەستیان بەپشکنین کرد. ئینجا بەدایکم وت: من خەونم نەئەبینی تەماشا بکە چیم خستۆتە تەنەکەی پیساییەکانەوە.

کاتی ئێوارە دایکم هەموو شتێکی بۆ باوکم و هاورێکانی گێرایەوە هەموویان دایانە پێکەنین و لەباوەشیان گرتم سکرتێری سەندیکای هێلی شەمەندەفەر لەماوەی مانگرتن دا دەستگیر کراوەو لەکاتی گواستنەوەی هەڵاتووە لەئاکامدا تەقەیان لێکردووە، دوای ئەمە بەرەو ماڵی ئێمەوە هاتووە بۆ ئەوەی جل و بەرگەکانی بگۆرێ و برینەکەی تیمار بکا پاش ئەمەش رای کردووە، باوکم بۆی باس کردم کە ئەمەیان چ جۆرە مرۆڤێکە و ژیانی ئێمە بەرەو چاکتر ببات بۆ ئەم مەبەستەش ئەوانەی مشەخۆرن و لەسەر ئێمە دەژین هەوڵ دەدەن بیکوژن و تەقەی

لیّ دەکەن بۆ ئەوەی جارێکی تر سەرکردایەتی مانگرتن نەکا. پاشانیش باوکم بۆی باس کردم کەمانگرتن چی دەکەیەنیّ.

درەختی سوارچاك

دابڕەکان ئەو کاتەی بەتەوەرەکانیان پیرە دار (زان) دەبڕیەوە پیاوێکی سوارچاکیان بەکەل وپەلی شەرەوە لەنێو کەلێنی دارەکە دۆزیەوە ئەوانیش لەرێگای دروشمەکەوە بۆیان ئاشکرابوو کە ئەمەیان یەکێکە لەپیاوە ئازاو بوێرەکانی کارلی یورگوند واش پێدەچیّ سوارچاکەکە خۆی لەنێو ئەم دارە حەشارداوە لەترسی ئەو کەسانەی بەدوایا دەگەڕان کەسەر بەسەربازەکانی (شا لودفیگی یانزەهەمین) . ئیدی لەم شوێنە ماوەتەوە تا ئەوکاتەی بیّ تاقەت بووە، دوای ئەمەش کەس نەیتوانیوە بیدۆزێتەوە . سوارچاکەکە بەتەنیایی دوای گریان وتکا و وێلّ بوونی سەری ناوەتەوە بەرانبەر بەمەش دارەکە بەزمانی خۆی وەلامی دەدایەوە وتا دەهات قەدی ئەستورتر دەبوو و کەلێنەکەشی تەسکتر دەبۆوە. لق وپۆپیشی زیاتر دەبوو بۆ حەوانەوە و دالّدەدەی کۆمەلّە بالّندەیەك لەوانەشە بەبەردەوامی رووی لەگەشەسەندن کردبا ئەگەر داربڕەکان دووچاری نەبووبان

# خۆشەویستی لەئەمەریکا

رۆژهەلات و رۆژئاوا دوو جەمسەری جیاوازو وێك نەچوون ئاماژە بۆ بارودۆخی سیاسی وئابوری  کۆمەلایەتی و رۆشنبیری ناکرێت کە هەر یەکەیان چ لێرە و چ لەوێ بەکۆمەلە ریژمێکی ئیداری ئالۆز کاروباری رۆژانەیان بەرێوە دەچێ، هەر چەندە لایەنە جیاجیاکانی بواری ژیانی مرۆڤ هەموو بەیەکەوە پەیوەستن ، لەم نووسینە کورتەدا باس باسی دلداری و خۆشەویستی و وەفای ئینسانە بەرامبەر شۆخەکەی لەرۆژئاوا و لەولاتێکی وەك ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لای خۆمان ئەوەی (هێمن) ی شاعیر دەری بڕی تائێستا کاریگەری خۆی هەرماوە ، بەلام بەشێوازو جۆرێکی تر کەدەلێ: نەما خانی چیرۆکی عەشقی ئێمە دارێژی دەنا هێشتا لەکوردستان دەژین زین و مەمێکی تر) ئێدی دێینە سەرباسەکەی خۆمان  ئەوکاتەی گوتمان کە خۆشەویستی لەم جیهانەدا هێشتا زیندووەو کاری سیحری خۆی بەسەر خەلکدا هەر بەردەوامە، زۆر کەس لای وابوو کە ئێمە لەخەیالدا دەژین و پروپاگەندە بۆ شتێکی لەناوچوو دەکەین کەچی خۆشەویستی هەرماوە، بەلام لەم جۆرانە نییە وەك ئەوەی لەفلیمێکی سینەمایی نیشان دەدرێ یاخوود ئەوەی خەریکی تەلەفۆنە یان شێوەی نامە نووسین بێ وباسی شەونخونی بکا خۆشەویستی هەر ماوە ، ئەگەر ئەو شوێنە بریتی بێ لەقەلایەکی سەختی سامانی دونیا خۆی دەردەبڕی بۆ کاروتەقەلادان و هەولدان نەوەك تەنها کارەکەی پێك هاتبێ لەقسەوقسەلۆك .

ئەو چیرۆکەی مەبەستمانە لە(فیلادفیا) ی ولاّتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا روویداوەو دەکریّ وەك چیرۆکەکانی (قیس و لیلا) و(رۆمیۆ وجۆلیّت) و (پۆلو فرجینی) سەیر بکریّت گرنگی لەوەدایە کە لەم دواییەدا ئاشکرابووە ، میّژووەکەی دەگەریّتەوە بۆ بیست سالّ پیّش ئیّستا بەمردنی پالّەوانەکەی لەمانگی تشرینی یەکەمی سالّی رابردوو کۆتایی هاتووە، بەسەرهاتی چیرۆکەکە بەم شیّوەیە بوو ئەنجومەنی ئیداری زانکۆی فیلادڤیا گەورەترین کۆمەکی بۆ هاتووە لەمیّژووی خۆیدا لەلایەن یەکیّکەوە کەنایناسن و هیچ کاتیّکیش مامۆستای ئەم زانکۆیە نەبووە ، بگرە لەویّش قوتابی نەبووە لەهەمان کاتدا زانکۆش بەهیچ شیّوەیەك جۆرە خزمەتیّکی پیّشکەش نەکردووە، کۆی ئەو یارمەتییەش گەیشتۆتە(پانزە ملیۆن دۆلار) و خاوەنەکەشی ملیۆنیّریّکی ئەمەریکاییە بەنیّوی(هارفی ویکسلر ) کە لەمانگی تشرینی یەکەمی سالّی رابردوو مردووە لەتەمەنی شەست و حەوت سالّیدا لیّرەدا پرسیاریّك دیّتە کایەوە ئایا (ویکسلر) بۆ ئەم پارە زۆرەی بۆ زانکۆ جیّ هیّشتووە؟ بۆ یەکەمین جارە چیرۆکی خۆشەویستی نیّوان ئەم ملیۆنیّرە و کچیّکی ئەمەریکی ئاشکرا دەبیّ کەبۆ ماوەی بیست سالّ بەژووانی یەکتر شاد دەبوون بیّ ئەوەی پەیوەندی یاسایی لیّکیان نزیك بکاتەوە واتە (ژن و میّر) ئەویش لەبەر چەند هۆیەك نەیان توانی ئەم کارە ئەنجام بدەن ، بەلّکو یاسایەکی تر هەیە کە دلّدارەکان وئەڤین پاکەکان دای دەریّژن کە یاسایەکی زۆربە هیّزو کاریگەرە (یاسای رۆحە) (یاسای خۆشەویست) یە (ویکسلر) بەم شیّوەیە وەسفی نازدارەکەی دەکا ،

جوانترین و ناسکترین و گەورەترین کەس لەم جیهانەدا ئەم کچەیە لەسەر تاسەری ژیانمدا ئازیزترین کەس بووەکە من ناسیومە ، کەچی ئەم شۆخە نازدارە لەساڵی ١٩٦١ دا مردووە بەرامبەر بەمەش (ویکسلر) ی داماو زۆر بەوەفاو دڵسۆزی ماوەتەوە یادی لەبیرنەکردووە تا مردنی لەوەسیەت نامەکەیدا بەدیار کەوتووە کە ئەم کۆمەکییەی بۆ زانکۆی فلادفیا پیچشکەش کردوە هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خۆشەویستەکەی تەنها قوتابی بووە لەم زانکۆیەدا ، پارە زۆرەکەشی بۆ ئەوە بووە کە ئیدارەی زانکۆ یادی خۆشەویستەکەی پیێ بکاتەوە ..... ئیتر خۆشەویستی ماوەو هەر دەمێنیێ چ لەئەمەریکا و چ لەشوێنێکی تر بیێ. لێرەدا دیمە سەر بابەتێکی تری چیرۆکی خۆشەویستی ئەو کاتەی (ئەریك سیگال) ی نووسەری ئەمەریکی رۆمانی ( خۆشەویستی ) بڵاوکردەوە یەك ملیۆن دانە لەم رۆمانە بەماوەیەکی کورت فرۆشرا، بیرۆکەی رۆمانەکەشی کرایە فلمێکی سینەمایی و بۆ ماوەیەکی زۆر خەڵکان تامەزۆری بینینی بوون... ئیدی هەر وەکو وتمان هەمدیسان دووبارەی دەکەمەوە خۆشەویستی هەرماوە چ لەرۆژهەڵات چ لەرۆژئاوا بەڵام هەریەکەو بەرێگای تایبەتی خۆی...

(لۆرکای) شاعیری ئیسپانی دەڵیێ:-

ئەی خەڵکینە ئاگاداربن

ئەوەی بەتەنها خاوەن یەك دڵە

ئەوە دڵی نییە

## راگەیاندن و ئاژانسەکانی دەنگوباس

راگەیاندن هەر لەکۆنەوە رۆڵ و ئەرکێکی مەزنی لەکاتی شەڕو ئاشتیدا بینیوە، چونکە پێویستە ئامرازێك یاخوود دەروازەیەك هەبێ بۆ گەیاندن و بلاوکردنەوەی هەواڵەکان بۆ ئەوەی خەڵکانێ دیکە بێ بەش نەبن و ئاگاداری گۆڕانکاری و رووداوەکان بن کەچی لەسەردەمەکانی پێشوو ئەم کردارە زۆر بەسادە وساکاریی ئەنجام دەدراو بەشێوەیەکی فراوان تەشەنەی نەدەکرد... زۆربەی زانیاریەکانیش پەیوەستی تەواوی دەسەلاتی سیساسیەوە بووە، ئیدی دوای چەند گۆرانکارییەك و پێشکەوتنی بنەڕەتی ژیانی مرۆڤایەتی راگەیاندنیش وەبەر لێشاوی شۆڕشی شارستانیەت کەوت و رەگ و ریشەی رێگاکانی کۆنی هەڵتەکاندو دەرگایەکی فرە جیاوازی لەبەردەم کرایەوە.... وای لێهات چەندەها تیۆرو لێکۆڵینەوەو توێژینەوە بێنەکایەوە و کۆلیژ و پەیمانگا بۆ ئەم مەبەستە دابمەزرێنن بۆ پێشخستن و دەرکەوتنی ئامانجەکانی ، بەهۆی ئەوەی زۆر جاران بەراگەیاندن وتراوە(دارێکی سیحروئەفسوناوییە) لەبەر ئەوەی کاریگەرییەکی زۆر گەورەو بەتوانا دەکاتە سەر مێشك و دەروونیخەڵکان وسیستەمێکی نوێ دێنێتە کایەوە.

ئێستا رۆژنامەو گۆڤارو پەرتووك و رادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەماو شانۆ و کۆمپیوتەر و کۆڕو چەند بوارێکی دیکە رۆڵی سەرەکی و گرنگ دەگێرن لەکۆمەڵگاکانی هاوچەرخدا . ئامانجی سەرەکی زۆربەی

فەلسەفەکان دابین کردن و هێنانەدی ژیانی ئاسایی وخۆشی مرۆڤە، جەختیش لەسەر ئەوە دەکەن تەنیایی بۆ مرۆڤ زۆر زەحمەتە لێرەدا هەموو بوارو لایەنە جیاجیاکانی ژیانی مرۆڤ بەیەکەوە پەیوەستن و پچڕانیش ئەگەر رووبدا ئەوا ماوەیەکی کورت دەخایەنێ وپاشن بەسەر دەچێت.

کرداری راگەیاندن کە پەیوەندیەکی بەتینی بەهەواڵ و زانیاری تازەوە هەیە پێویستە بەراشکاوی و راستگۆییی بڵاوبکرێتەوە لەپێناو بەدی هێنانی ئامانجە سەرەکییەکانی بۆ پێشخستن و بەرزکردنەوەی ئاستی رای گشتی بەمەبەستی ڕۆشنبیرکردن و ڕۆشن کردنەوەی بیرو بۆچوونی ئەو خەڵکەی هەمیشە تامەزرۆی هەواڵی تازەن کەدوور بێت لەکاری هەڵخەڵەتاندن و فرت و فێڵ و بێگومان ئەمەشیان پەیوەستە بەپێشکەوتنی بارودۆخی کۆمەڵگا، ئامرازەکانی راگەیاندنی ئێستا رۆڵێکی بەرچاوو پتەو دەگێڕن لەمانە. ڕۆژنامەو گۆڤارو پەرتووك و رادیۆ و تەلەفزیۆن وسینەما کۆرو بڵاوکراوەکان کەبەئامرازی گرنگ وبایەخدار دەژمێردرێن بەتایبەتی لەکۆمەڵگەکانی تازەدا.... لێرەدا راگەیاندن پێویستیەکی کۆمەڵایەتیەو زۆربەی بەشە جیاجیاکانی وڵات بەیەکتر دەبەستێتەوە و هیچ رژێمێکی سیاسی لەبارودۆخی ئێستادا ناتوانێت فەرامۆش وپشت گوێی بخات، چونکە شوێنێکی گرنگ لەبوارەکانی فیکری و سیاسی و دێنێتەدی و کاریگەرییەکی گەورە دەخاتە سەر باری گشتی لەهەموو لایەنەکانی ژیان، بەڵام پێویستە

ئەوەش بوترێت کەئامرازەکانی راگەیاندن لەهیچ ولآتێکی سەرانسەری جیهاندا بەشێوەی ئازادی تەواو دابین نەکراوە، بەڵکو هەر ولآتێك شێوازی سانسۆری بۆ راگەیاندن بەکار دەهێنێ ئەمەشیان پەیوەستە بەبارودۆخی گشتی کۆمەڵگا و سروشتی رژێمە کۆمەلآیەتیەکان. جیهانی ئێستامان بەتۆرێکی زەبەلاحی گەوری راگەیاندن بەستراوەتەوە زۆربەی ولآتانی رۆژهەلآت دەربارەی ململانێی دەسەلآتی سیاسی و گۆرانکارییەکانی نێو خەلچك هەمیشە هەوڵ دەدەن جیهانی دەرەوە ئاگاداریان نەبێت و هەوالچەکانی ئەم جۆرە بابەتە بلآونەکەنەوە.

هەرچەندە زۆر نهێنی ئەگەر ئێستاش ئاشکرا نەبێت بۆماوەیەکی دیکە لای خەڵك روون دەبێتەوە هەر لەبەر ئەمەشە هەندێ ولآتانی رۆژهەلآت بەوولآتانی داخراو لەقەڵەم دەدرێن ، چونکە زانیاریمان سەبارەت بەرووداوەکانی ناوەخۆ زۆر کەمە وێرای ئەمانەش چەند هۆکارێکی بنەڕەتی دووچاری ئەم ولآتانە بوونەتەوە لەوانە لاوازبونی ژێرخانی ئابوریيان کەکاردەکاتە سەر ژیانی هاولآتیان و زۆربەی دانیشتوانیان نەخوێندەوارن تائێستاشی لەگەڵدابێ هەندێ دێهاتەکانی وزەی کارەبایان تیانییەو ئاگاداری زۆربەی بلآوکراوەکانی راگەیاندن نین، ئەم ولآتانە زۆربەیان بەکۆمەڵگای کشتوکاڵی دەژمێردرێن، بەپێچەوانەی ولآتانی پیشەسازییەکانەوە کەئامرازەکانی راگەیاندن لەزۆربەی کاتدا بەهۆی چڕوپڕی و ئاڵۆزییەوە گەیشتۆتە لوتکە لەرێگای ئەو دەزگایانەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراون، بۆ نموونە لەسەر

ژمێرییەکی ساڵانی هەشتاکان راگەیاندن لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەیشتۆتە ئەم ئاستەی خوارەوە (١٧٥٠) رۆژنامەی رۆژانە بەزمانی ئینگلیزی دەردەچێت(٣٤٠٠) پەخشی ئێزگەیی هەیە کەبەرنامەی جۆراو جۆر بلاودەکەنەوە جگە لەمەش (٧٥٠) پەخشی ئێزگەیی تەرخان کراون بۆ بلاوکردنەوەی پارچە مۆسیقای هێمن و ئارام هەروەها (٦٥٠) پەخشی تەلەفزیۆنی بەرنامەکانی تیادا بلاودەکرێنەوە(٧٥٠٠) گۆڤاری هەمەجۆری تیادایە. لەراوەرگرتنێکدا کە لە وڵاتی فەرەنسا سازدراو خەڵکانێکی زۆری گرتەوە بۆ ئەوەی رای خۆیان دەربڕن دەربارەی ئەم سێ ئامێرەی خوارەوە تەلەفزیۆن و ساردکەرەوەو جل شۆرین ئەنجامی راوەرگرتنەکە بەم شێوەی خوارەوە بوو، لەسەدا ٤٤ دەنگیان بۆ تەلەفزیۆن بوو وە لەسەدا ٣٣ بۆ ساردکەرەوە وە لەسەدا ١٦ بۆ ئامێری جل شۆرین. ئالێرەدا بەدیار دەکەوێ راگەیاندن چ شۆرشێکی بیری خولقاندوە و مرۆڤی ئێستا ناتوانێت فەرامۆشی بکات وەك ئامرازێکی شارستانی گەورە رۆڵی خۆی دەگێرێ و هەمیشە لەپەرەسەندن دایە لەپیناو هێنانەدی ئامانجەکانی لەراستیدا سەدەی نۆزدەهەم زۆر گۆرانکاری و پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی بەردی بناغەی بۆ گەڵی پرۆژەی هەمەجۆر دانا لەم بارەیەوە سەدەی بیستەم قەرزاری سەدەی پێشووە لەبەر ئەوەی کەسانێکی زۆر لێهاتوو شارەزا دەستیان بەتەواوکردنی پرۆژەکانی سەدەی پێشوو کردو لەزۆر لایەنەوە پێشکەوتنی تازەیان خستەپاڵ و توانیان خزمەتێکی

چاکی مرۆڤایەتی بکەن ئیدی ئەم بوارە واتە بواریداهێنانی تازە لەهەموو ئاستەکانی ژیانی مرۆڤ هەر بەردەوامە ئاژانسی دەنگوباس رۆڵێکی گرنگ و بەرچاو دەگێڕێ بۆ دەزگاکانی راگەیاندن وەکو رادیۆ و تەلەفزیۆن و رۆژنامەو گۆڤار....هتد. کاریگەری ئەمانەش زۆر بەزەقی بەسەر ژیانی مرۆڤایەتییەوە دیارەو بۆتە بەشێك لەژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی ئێستا،( شارل هافاس) ی فەرەنسی بەیەکەم کەس دەژمێردریچت لەدامەزراندنی ئاژانسی دەنگوباس ئەم پیاوە ئیمپراتۆری رۆژنامەکانی ئەوسای فەرەنسا بووە پارە و پولێکی زۆری هەبووە پەیامنێری لەهەموو ناوچەکانی فەرەنسا دانابوو بۆ گواستنەوەی هەواڵ و ئەو رووداوانەی بەرپا دەبن بۆ ئەوەی لەرۆژنامەکان بڵاوببنەوە....(هافاس) بەحوکمی بنکەی دەسەڵاتی خۆی پەیوەندی لەگەڵ بانقەکان و میرەکان و کەسانی بەدەسەڵات پەیداکردبوو، جگە لەمەش پەیامنێری لەزۆربەی شوێنەکانی جیهان هەبووە.... بۆئەمەش لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە ئاژانسێکی دامەزراند بەناوی ئاژانسی (هافاس) بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان دوای (هافاس ) دوو ئاژانسی دی لەئەوروپا هاتنە کایەوە.هافاس رۆلێکی بەرچاوو دەستێکی باڵای بینیوە لەپشتگیری کردن و یارمەتیدان وپەیدابوونی ئەم دوو ئاژانسە ، یەکێکیان بەناوی (بیرن هاردن ولف) بوو ئەوی تریشیان بەناوی ( جۆلیۆس رۆیتەر)بووە... یەکەمیان لەساڵی ١٨٤٩ دامەزرا بەناوی (نوسینگەی ولف) تاکاتی هاتنی نازییەکان بۆ سەر حوکم لەئەڵمانیا

بەگەورەترین ئاژانسەکانی ئەوروپی لەقەڵەم دەدرا لەناوەڕاستی سەدەی هەژدە- یش رۆیتەر لەلەندەنی پایتەختی بەریتانیا ئاژانسی رۆیتەری رۆیتەری دامەزراند. (رۆیتەر) بەزیرەکی و چاپووکی و لێوەشاوەییەوە ناسراوە لەمەڕ بەکارهێنانی هەندێ ئامرازو رێگا بۆ گواستنەوەی هەواڵەکان هەر ئەم رێگەیە (رۆیتەر) گرتبوویەبەر بووە بناغەیەك بۆ دامەزراندنی یەکەم ئاژانسی ئەمەریکی بۆ هەواڵەکان، ئیتر رۆژنامە گەورە تواناکانی شاری نیویۆرك بریاریندا لەساڵی (١٨٤٨) وە بەلەمی خێرا بەکرێ بگرن بۆ ئەوەی پێشوازی لەکەشتییە گەورەکان بکەن بۆ گواستنەوەی ئەو هەواڵانەی لەئەوروپاوە دەنێردرێن. لەناوەڕاستی سەدەی هەژدە (ئاژانسی ئەسۆشێدپریس) دامەزرا جگە لەمەش دوو ئاژانسی دیکەش لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەریان هەڵدا. یەکێکیان لەساڵی (١٩٠٧) بوو بەڵام لەساڵی ١٩٥٨) دا ئەم دووئاژانسە یەکیان گرت بەناوی (یونایتد پریس ئینتەر ناشناڵ) ئێستا ئەم ئاژانسەی خوارەوە لەجیهاندا کاردەکەن

١-ئاژانسی فرانس پرێسی فەرەنسی (هافاسی) پێشوو

٢-ئاژانسی رۆیتەری ئینگلیزی

٣-ئاژانسی ئەسۆشیدپریسی ئەمەریکی

٤-ئاژانسی یونایتد پرێس ئینتەر ناشناڵ

٥-ئاژانسی تاسی سۆڤیەتی پێشوو لەجیاتی ئەمە ئێستا دوو ئاژانس لەرووسیا کاردەکەن بەناوی ئینتەر فاکس و ئینتەر تاس ....

لەم ساڵانەی دوایی و بەهۆی بەکارهێنانی ئینتەرنێت تادێت ڕۆڵی راگەیاندن بەرەو جیهانێکی فراوان دەڕوات لەپێناو کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی زانیاری تازە.

مرۆڤایەتی وەچەرخانێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە تا ئێستاش کردارەکە بەردەوامە بەهۆی پێشکەوتن و داهێنانی تازە لەسەرجەم لایەنەکانی ژیان بەتایبەتیش بواری راگەیاندن ئەم کردارەش بەئاسانی سەری هەڵنەداوە بەڵکو لەرێگای هەوڵ و کۆششی بێ وچان هاتۆتە دی زۆربەی شارەزایان و پشپۆران لەسەر ئاستی جیهاندا لەو باوەڕەدان کەجیهانی ئێستامان وەك گوندێکی هاوچەرخی لێهاتووە سەرەڕای رووداوەکانی پشت پەردەش لەئایندەکی نزیکدا هەواڵ و رووداوە شاردراوەکان ئاشکرا دەکرێن و بڵاودەبنەوە.

دەزگاکانی راگەیاندن توانیویانە روو لەسەرجەم شوێن و ناوچە جیاجیا کانی ئەم سەرلابەرن بۆ مەبەستی بڵاوکردنەوەیان گەلی کوردیشوەك هەموو گەلانی دی وێڕای ئاڵۆزی و گرژی باری جوگرافیا وزۆڵمی مێژوو و قوربانی رێکەوتننامەکانی نێو دەوڵەتی توانیویەتی خۆی لەم بوارە بێ بەشنەکات ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ و دەرکەوتنی یەکەم رۆژنامە بەناوی کوردستان نیشانەیەکە بۆئەوەی کوردیش لەرەوتی پێشکەوتنی رۆژنامەگەری بێتە نێو گۆرەپانی راگەیاندن ، بەڵام دوای راپەرین ئەم لایەنە بەشێوەیەکی زەوقترو بەرچاوتر رەنگی دایەوە و گەلێ رۆژنامەو گۆڤارو بوراەکانی دیکەی راگەیاندن لەدایك

بون و تەكانێكی گەورەو گوروتینێكی بەتوانایان هێنایەدی وەك سەرەتایەك بۆ پرۆژەی رۆشنبیری راگەیاندن بەرادەیەك كە كاریگەریەكی بەهێزی خستۆتە سەر پێكهێنانی رای گشتی ئەمەشیان بێگومان پەیوەندییەكی قووڵی بەباری كۆمەلآیەتی كۆمەڵگای كوردییەوە هەیە، لەیادی سەدوسیچ سالچەی رۆژنامەگەری كوردیدا باهەموو تواناكانمان یەك بخەین بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی سەرەكی ویست و ئارەزووەكانی گەل و نیشتمان و ووشەی رەسەنی كوردی كەپێكهاتەی هەگبەی بەدرخانییەكان و موكریان و پیرەمێردو شۆڕەسوارانی رۆژنامەگەری كوردی بێت، هەروەها تالەتواناشماندایە راگەیاندن بەهەموو شێوەكانیەوە لەقالچبی داخراو و بیركردنەوەی تەسكدا دەرباز بكەین و راگەیاندن بەتەنها بۆ وێنەو هەواڵی بەرپرسان تەرخان نەكەین ، بەڵكو بەجۆرێكی هاوچەرخ و شارستانیانە مامەڵە لەگەڵ رووداوەكان بكەین بەناوەرۆكی بەسوود و بابەتیانە روو لەم لایەنە گرنگە بكەین بۆ ئەوەی بتوانین لەكەنار دەریای فراوانی راگەیاندن نزیك ببینەوە ، راگەیاندنیش ببێتە پرۆژەیەكی رۆشنبیری هەمەلایەن.

## (تۆنی مۆریسۆن)ی رۆماننووس

رۆماننوسی ئەمەریکی (تۆنی مۆریسۆن) لەساڵی ١٩٩٤خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب ی وەرگرت رۆمانێکی لەساڵی ١٩٩٨ بەناوی(فەردوس) دوای وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ نووسی بۆ جارێکی تر بایەخی پێدرایەوە لەبەر ئەوەی پاش وەرگرتنی خەڵاتەکە ماوەیەك بێدەنگ بوو. مۆریسۆن لەرۆمانی فیردەوس کارەساتی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕەش پێستەکان بەدیار دەخات هەر وەکو چۆن لەرۆمانەکانی تریش ئەم کارەی کردووە، لەوانە (ئەو چاوەی بەزۆری شینە، خۆشەویستەکەم، جاز) و چەند رۆمانێکی تر، بەڵام ئەمجارەیان رۆماننوس بۆ مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ رووداوێکی راستەقینە کە لەساڵی ١٨٦٥ لەماوەی کۆتایی جەنگی ناوەخۆی ئەمەریکا سەری هەڵداوە، ئەو کاتەی کۆیلەکانی باشووری وولات بەگوێرەی بڕیاری یاسایی سەرۆك(ئیبراهام لنکۆڵن) ئازاد کران. تیایدا سیستەمی کۆیلایەتی هەڵوەشێنرایەوە لەم روانگەوە بەهەزاران کۆیلە ئەوانەی ئازادکران لەزەویەکانی پێشویان لەباشوور دەستیان بەکۆچکردن کرد بۆ ناوچەکانی رۆژئاوا. ئەمەشیان وەك هەوڵدانێك بۆ لەبیر کردنەوەی بیروباوەریەکانی کۆمەڵایەتی و هەنگاونان بۆبنیاتنانی ژیانێکی تازەو هەروەها لەم ناوچانە کۆمەڵەیەکی تایبەتیان پێکهێنا کە سپی پێستی تیادانەبوو ئەمەش لەیۆتۆپیای تازە دەچوو.

ئەم خەڵکانە بەهەزاران میلیان بڕی بۆ ئەوەی لەم رابردووە تاڵە رابکەن و چەندین کێڵگەی لۆکەیان جێهێشت و روویان لەزەویەکی

چۆڵەوانی کرد، زەویەك کە سەرەتای هەیە و خاوەن رابردوو نییە، لەم شۆنگەوە ئەم بابەتە لەرووی مێژووی رووداوەکان و کاریگەریەتی بەسەر مێژووی ئەمەریکی هاوچەرخ دەوڵەمەندو بەپێزە، ئالێرەدا (تۆنی مۆریسۆن) دەست بەنووسینی رۆمانە تازەکەی دەکات و بەگوێرەی مێژوو بۆ ماوەی سالآنی شەستەکان و حەفتاکان دەگەرێتەوە ، بەپێی شوێنیش هەردوو ناوچەی (رۆبی) و (ئۆکلاهۆما) دەگەرێتەوە نەوەکانی ئەو کۆچەرانە کۆمەڵەی یەکەمی رەشپێستە ئازادکراوەکان پێکدەهێنن.

رۆماننوس لەسەرەتاوە بەرستەیەکی چاوەڕوانکراو دەستپێدەکات کەدەڵێ $\Lambda$ کچە سپییەکەیان کوشت) یەکسەر هاوکێشەکە ئەنجامەکەی بەم شێوەیە دەبێت کێ کچە سپییەکەی کوشتووە؟ بەڵام یەکەمین جار ئەم کچە سپییە کێیەو ئایا بونی چۆن رێکەوتووە لەمەملەکەتی ڕەشپێستەکان؟ رۆمانەکە لەم بارەیەوە هیچ شتێکمان پێناڵێ کەچی ئێمە بەردەوام دەچینە نێو ئەو بابەتەی کەپەیوەندی بەکاری کوشتنەوە هەیە، لێرەدا واپێدەچێ بکوژو کوژراو لەلایەن مۆریسۆن گرنگی نەبێت، بەڵکو بایەخ بەکاری کوشتنەکە دەدات وهیچ نەژادێك تاوانبار ناکات و دەیەوێت بڵێ توندوتیژی بەتەنیا پەیوەست بەنەژادێکەوە نییە.

لەرۆمانی ئەوچاوەی بەزۆر شیینە کە لەساڵی ١٩٧٠ دەرچوو لەسەرەتا ٧٠٠ دانەی لێ فرۆشرا ، تیایدا مۆریسۆن سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێ کەجیهان شکستی هێناوە بۆ ئەوەی جوانی لەمرڤی رەشپێستدا ببینێ(بیکۆلا بریدلۆڤ) کیژۆڵەی ١١ ساڵ بەتامەزرۆییەوە

هەوڵدەدات ببێتە خاوەن دووچاوی شین هەروەکو کچە سپییەکان لەو باوەڕەدایە ئەگەر ببێتە خاوەن دووچاوی شین ئەوا بەختەوەری تەواوی بۆ دێتەدی و گیروگرفتەکانی خێزانەکشی چارەسەردەکرێ، لەهەمان کاتیش وادەکات کەباوکی دایکی خۆشبوێتوواز لەمەی خواردنەوەش بهێنێ.

ئالێرەدا مۆریسۆن لەم رۆمانەی چەند دیمەنێکی تۆقێنەر نیشان دەدات کەپێشتر نووسەری تر نەیتوانیوە بچێتە نێو بابەتەکە، دیمەنی ئەو باوکەی سەرخۆشە و دەستدرێژی دەکاتە سەر بیکۆلا دیمەنێکی دەگمەن نییە لەرۆمانەکانی مۆریسۆن بەهۆی ریسوابوون و ناماقوڵییەکەی.

لەدووەم رۆمانی بەناوی سولا کە لەساڵی ١٩٧٣ دەرچووە بەبەردەوامی هەوڵدەدات ئەم توندوتیژییە ئاشکرا بکات بەتایبەتی توندوتیژی کەدژی ئافرەتان پیادەدەکرێ بەڵام لەرۆمانی سێیەمی (گۆرانی سولومون) دەگەرێتەوە بۆ یەکەم رۆمانی کەچی بەشێوەیەکی پێچەوانە گرنگی بەشیکردنەوەی هۆیەکانی توندوتیژی دەدت کەزاڵن بەسەر هەڵسوکەوتی پیاوان ئەو هێزەی دەبێتە هاندەری ئەم کارە هەروەها هاوکاری ئافرەتان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە.

لەرۆمانی (خۆشەویستەکەم) دا رەخنەگران بەیەکێك لەگرنگترین رۆمانەکانی سەدەی بیستەم ئەمەریکی لەقەڵەم دەدەن هەرچەندە هەندێکی تر رۆمانی فیردەوسی تازەی بەگرنگترین کاری ئەدەبی دەژمێرن. رۆمانی خۆشەویستەکەم ساڵی ١٩٨٧ دەرچوو نووسەر تیایدا

باسی ناوەڕاستی سالچی ١٨٠٠ دەكات ئەمەش لەرێگەی ژیانی (سیس) ئەو ئافرەتە رەشپێستەی كە قورگی منداڵەكەی دەبڕێ بۆ ئەوەی هەروەكو خۆی نەبێتە كۆیلە ، بەلاّم لێرەدا تارمایی ئەو منالّە لەگەلّ ژیانی سیس بەردەوام دەبێ و ناتوانێ لێی رزگاربێت لەكۆتاییدا بەشێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو كچێكی جوانی تەمەن بیست سالّ بەدیار دەكەوێت كەئاسەواری رووداوەكەی پێوە دیارە ، هێزو توانای ئەم رۆمانە و وەسفی مۆریسۆن كاریگەری بۆ ژیانی كۆیلایەتی دوو هۆی سەرەكی بون بۆ پالاّوتنی بۆ خەلاّتی نۆبلّ.

هەندێ كەس رایان وایە ئەم ڕۆمانە خەلاّتی نۆبلّی بەدەستهێنا هەروەكو چۆن هەماهەنگوای لەرۆمانی پیرۆو زەریا و نەجیب مەحفوز خەلاّتیان بەدەست هێنا، لەبڕیاری لیژنەی پادشایەتی سویدی لەكاتی بەخشینی خەلاّتی نۆبلّ بەمۆریسۆن هاتووە(ئەم ئافرەتە رۆماننوسە ئەمەریكییە لایەنێكی ژیانی گرنگی لەواقیعی ئەمەریكی زیندوو كردۆتەوە لەرێگەی رۆمانە بەپێزەكانی كەپەیوەستن بەخەیالّێكی بێ پایان و ناوەرۆكێكی شاعیری) هەر لەم بارەیەوە (مارتن سیمۆن) دەلّێ: گرنگترین ئافرەتی رۆماننوسی رەشپێست لەئەمەریكا دوای رالف ئەلیسۆن مۆریسۆنە .

## تیۆری ئازادی لیبرالیزم

ئەم تیۆرە لەنێو کۆمەڵگای ئەوروپی سەری هەڵدا ، لەئەنجامی چەند گۆران وپێشکەوتنێك لەبورای سیاسی و کۆمەلایەتی گرنگترینیان شۆڕشی فەرەنسیە کە لەساڵی ۱۷۸۹ بەرپا بوو ئەم شۆڕشە مافەکانی مرۆڤی جاڕدا، هەروەها بارودۆخێکی ئابوری هێنایە کایەوە لەچوارچێوەی (لێ گەڕێ باکاربکات لێ گەڕێ بابڕوات) ئەمەشیان مانای ئەوە دەگەیەنێ کەواز لەمرۆڤی ئەوسا بهێندرێت بۆ ئەوەی ئازاد بێت لەچالاکیەکانی ئابوری و جموجۆڵەکانی بیرکردنەوەی بێ ئەوەی دەوڵەت مافی ئەوەی هەبێت دەست لەکارەکانی وەربدات. بێگومان ئەم تیۆرە خاوەنی چەند فەیلەسووفێك بوو لەرێگای نووسینەکانیان و بیروڕایان ناوەرۆکی ئەم تیۆرە لەزۆربەی ولاتانی ئەوروپی و ئەمەریکا بلاوبوۆوە، تیۆری ئازادی جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ تیۆری ئازادی جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ تیۆری دەسەلات هەیە، چونکە ئەم تیۆرە باوەڕێکی رەهای بەمرۆڤ هەیە، بەلام تیۆری دەسەلات لەروانگەیەکەوە سەیری مرۆڤ دەکات کەبەشێکە لەکۆمەڵ ودەبێت لەم بوارەوە کاربکات بەگوێرەی تیۆری ئازادی هەموو شتێك دەبێ تەرخان بکرێت بۆخۆشی گوزەرانی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ لەدەوڵەت بەرزترە دەوڵەت و حکومەت لەپێناو ئازادی و ئاسوودەیی مرۆڤ هاتونەتە کایەوە..

دەوڵەت دروست بووە بۆ بەرژەوەی مرۆڤ نەوەك بەپێچەوانەوە، خاوەنەکانی ئەم تیۆرەوای بۆ دەچن کە حکومەت لەپێناو خزمەتکردنی مرۆڤ هاتۆتە دی بۆ ئەوەی ئازادییەکان دابین بکات. نەوك رێگایان

لێبگرێت و كۆتیان لەبەردەم دانێ... هەر كاتێكیش ئەم حكومەتە سەرپێچی لەم بارەیەوە كرد، پێویستە لابردرێت لەم روانگەوە بۆمان دەردەكەوێت ئەم تیۆرە جەختی لەسەر بنەماكانی ئازادی تاكەكەس دەكردەوە....دیدو بۆچوونی ئەم رایانە كاریگەرییەكی تەواوی كردە سەرئەوانەی دەستوریان لەهەندێ ولآتانی ئەوروپی بەتایبەتیبەریتانیا دانا هەر لەو كاتەدا حزبی سیاسی بەدیار كەوتن داوای ئازادی سیاسی و كەمك كردنەوەی دەسەلآتی پادشایان دەكرد لەراستیدا فەلسەفەو بیروراكانی ئەم تیۆرە راوبۆچونی چەند نووسەرێكی لەخۆوە گرتبوو بەناو بانگترینیان( جۆ لۆك) ە ئەم نووسەرە لەسەدەی حەڤدەهەم دیاردەكانی سیاسی شی كردەوەو پەیوەندی نێوان دەسەلآت و گەلی لەسەر بنكەیەكی گشتی دەست نیشانكرا، كەدەڵێت (گەل سەرچاوەی دەسەلآتەكانە) بەمەش (جۆن لۆك) هاوكێشەی پێشووی گۆڕی كاتی تیۆری دەسەلآت وای نیشان دەدا گوایە (پاشا سەرچاوەی دەسەلآتەكانە) لەبەر ئەمە راكانی (جۆن لۆك) لایەنگیریەكی زۆری لێكرا لەنێو لایەنە سیاسیەكان و كاری كردە سەر شۆڕشەكانی فەرەنسی و ئەمەریكی.... بەگوێرەی (جۆن لۆك) پێویستە حكومەت لەپێناو گەل كاربكات ، چونكە گەل بەچەند مەرجێك وەزیفەكانی حكومەت دیاری دەكات لەمانە:

١- وەزیفەكان پیادە بكات لەپێناو بەرژەوەندی گەل
٢- ٢-مافی گەلە هەر كاتێك حكومەت كاروبارەكانی بەشێوەیكی گونجاو بەرێوەنەبرد، هەوڵ بۆ لادانی ئەم حكومەتە بدات.

٣- گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە دەبێت هەر ئەویش بڕیاری مانەوەی حکومەت یاخوود لابردنی بدات...جگە لەمانەش (لۆك) ئاماژەی بۆ ئازادی رۆژنامەگەریش کردووەو رای وایە نابێت کۆسپ وتەگەرەی بخرێتە بەردەم ، کەچی پێویستە لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و سیستەمی گشتی هەنگاوەکانی بخرێنە کار. (جۆن ملتۆن) فەیلەسووفێکی تری سەدەی حەڤدەهەمەو داکۆکی لەتیۆری ئازادی دەکردو لەنووسینەکانی جەختی لەدابینکردن و بڵاوبوونەوەی بیروراکانی کۆمەڵگای سیاسی دەکرد، هەروەها زۆربەتوندی داکۆکی لەئازادی رۆژنامەگەری دەکردو رەخنەشی ئاراستەی سیستەمی سانسۆری سەر رۆژنامەکان دەکرد، لەمبارەیەوە رای وابووە(لەتوانای مرۆڤ نییە راستیەکانی لەلا روون و ئاشکرا بێت ئەگەر بێتوو گوێ بۆ راپێچەوانەکانی تر نەگرێت، چونکە راستییەکان ناتوانن زامنی مانەوەی خۆیان بکەن، لەبەر ئەوە پێویستە رووداوەکان بەراشکاوەی و لەقالبێکی تەواودا مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

کەچی لێرەدا رەخنە ئاراستەی ملتۆن دەکرێت ، سەبارەت بەوەی دیموکراسی خوازنەبووە، چونکە بەگوێرەی فەلسەفەکەی ئەرکی گفتوگۆ کردن وباسکردنی بابەتەکان مافی کەمینەیەك بووە، ئەوانەی لێهاتوو شارەزایان هەیە زۆربەی خەڵکیش مافی ئەوەیان نییە بەشداری تیادا بکەن. لەفەیلەسوفانی سەدەی هەژدەمیش (تۆماس جفرسۆن)ی فەیلەسووف وسیاسەت مەداری ئەمەریکیمان هەیە کەکارگەری راکانی (جۆن لۆك) ی

بەسەرەوە دیارە (جفرسۆن) جەختی لەحوکمرانیەتی زۆرینەو داکۆکی لەئازادی رۆژنامەگەری دەکرد، لەم بارەیەوە دەیگوت:

رۆژنامەگەری سەرچاوەی یەکەمی زانیارییەکانن و گەل لەم رێگایەوە دەتوانێت رایەکی یەکگرتوو لەسەر زۆربەی کێشەکان دروست بکات، هەروەها رەخنەی لەو حکومەتانە گرت ئەوانەی دیانەوێت رۆژنامەکان بخەنە بەر رکێفی سانسۆرەوە، جگە لەمەش ( جفرسۆن) رای وایە پێویستە حکومەت بەرەخنەی رۆژنامەگەری بابەتیانە قایل بێت و رێگای لێنەگرێت و لێشی نەترسێ....

لەسەدەی نۆزدەمیش (جۆن ستیوارت میل) ی فەیلەسووف بەراشکاوی باسی ئەوەی کرد، کە پێویستە رێگا لەسەربەستی بیرکردنەوەو گفتوگۆی مرۆڤ نەگیرێت بەمەرجێ ئەگەر بێت و زیان بەکۆمەڵ نەگەیەنێت، هەروەها پێویستیشە هەموو چالاکییەکانی مرۆڤایەتی بۆ بەرژەوەندیخزمەتکردنی مرۆڤ ئامادەبکرێت، بەرای ئەم فەیلەسووفە باشترین کۆمەڵگای سیاسی لەوەدایە رێگا بەرۆڵەکانی بدات بەشێوەیەکی سەربەست و ئازادانە بیربکەنەوەو گوزارشت لەبیروباوەرەکانیان بکەن، کەدووربێت لەکرداری ترس و دوو دڵی ئەگەر بێت و یەکێك هەوڵی بێ دەنگی رایەك بکات و ئەواراستی بۆ ماوەیەك دەشارێتەوە، ئالێرەدا راکانی ئەو کۆمەڵە فەیلەسووفە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەرکەم کردنەوەی سانسۆری حکومەت بۆسەر رۆژنامەکان وپانتایی کارکردنی رۆژنامەکان وسەربەستیان فراوانتر کرد، بناغەی بیری سەرەکی ئەو فەیلەسووفانە بۆ فەلسەفەی یاسای

سروشتی دەگەڕێتەوە کەجەخت لەسەربەستیتاکەکەسی بەشێوەیەکی گشتی و سەربەستی رۆژنامەگەری دەکات. بەڵام خاڵێکی گرنگ لەتیۆری ئازادی دێتە بەرچاو دەربارەی رۆژنامەگەری ئەوەیشیان ئەوەیە کەنابێت بەشێوەیەکی رەها سەیری ئەم بوارە بکرێت و پێویستە هەندێك شێوازو سنوری بۆ دابنرێت، لەبەر ئەوەی سەربەستی رەها لەهیچ رژێمێکی سیاسی بەدی ناکرێت.

بەڵام خاڵێکی گرنگ لەتیۆری ئازادی دێتە بەرچاو دەربارەی رۆژنامەگەری ئەوەیشیان ئەوەیە کەنابێت بەشێوەیەکی رەها سەیری ئەم بوارە بکرێت و پێویستە هەندێك شێوازو سنوری بۆ دابنرێت لەبەر ئەوەی سەربەستی رەها لەهیچ رژێمێکی سیساسی بەدی ناکرێت.

لەبەر ئەمانە راوبۆچوون زۆر هاتنە کایەوە بۆ رێکخستن و بەرێووە چوونی رۆژنامەگەری یاسا رۆڵی خۆی ببینی بۆ دیاریکردنیئەو کارانەی رۆژنامەکان هەوڵیان بۆ دەدەن لەپێناو پاراستنی کۆمەڵگاو سیستەمی گشتی.

لەکۆتایدا جیاوازی نێوان تیۆری دەسەڵات و تیۆری ئازادی لەوەدایە یەکەمیان کۆت و زنجیر بەبێ هیچ پاساوێك دەخاتە بەردەم هاوڵاتیان و دووەمیشیان کۆسپ و تەگەرە دادەنێت، بەلام لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و بەبێ ئەوەی کاربکاتە سەر بنەڕەت و بنەماکانی ئازادی مرۆڤ.

## کورتە باسێکی مێژوویی دەربارەی تیۆریەکانی نەژادگەری

سەرەتا تیۆریەکانی نەژادگەری ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەنەژادەکانی مرۆیی لەرووی بایلۆژیەوە لەیەکتر دوورن ئەمەشیان لەجیاوازی پێشکەوتنی شارستانی یەتی و کۆمەڵایەتی رەنگی داوەتەوە، هەندێ نەژاد بەگوێرەی سروشتی خۆیان لەوانی تر بەرزترن و توانیویانە کۆمەڵگەی مەدەنی وشارستانیەتی پێشکەوتوو دروست بکەن.

بەڵام نەژادی تر ناتوانن لەگەڵ رەوتی پێشکەوتنی نەژادە بەرزەکان ژیان بەسەر بەرن بەمەش لەئەنجامدا ململانێ ی سیاسی دێتە کایەوە بۆ ئەوەی دەسەڵات بخەنە ژێرچر دەستی خۆیان. بیرۆکەی جیاوازی نێوان نەژادەکان یەکێك بووە لەهۆکارە گرنگەکانی سیاسی نێو گەلان و خەڵکان، کەچی لێرەدا ناتواندرێ بەشیچوەیەکی وردئەو کاتە دیاری بکەینکە ئەم جیاوازیەی تیا سەرهەڵداوە کەهەندێ لەزانایان رایان وایە لەوانەیە سەرچاوەکەی بۆ جیاوازی و لایەنی شانازی و گەورەیی هۆزایەتی بگەرێتەوە...هەرچەندە (ئەرستۆ) پێشتر ئاماژەی بەجیاوازی نێوان (ئازادی خوازان) و(کۆیلەکان) داوە ئەمەشی بۆ سروشت گەراندۆتەوەو پێی وایە هەندێ نەتەوە بۆ سەروەری و دەسەڵات هاتونەتە دی هەندێکی تریشیان بۆ کۆیلایەتی ن یەکەمیان فەرمانڕەوایەتی دەکات، دووەمیشیان مل کەچ دەبێت، هەروەها ئەرستۆ نووسیویەتی و دەڵێ کێشە رەگەز پەرستی درێژخایەن جیاوازی

چینایەتی نێوان گەلانە، لەکۆتاییدا گەیشتۆتە ئەم ئەنجامە: نایەکسانی نێوان رەگەزەکان کارێکی رەسەنایەتی پێك هاتەیانەو ناشتوانریچت بەهەر شێوەیەك بێت ئەم کردارە لەناو ببردرێت لەبەر ئەوە لەسەر نەتەوە لاوازەکان پێویستە ملکەچی نەتەوە بەرزەکان و بەتواناکان بن.

تیۆریەکانی نەژادگەری بەشیچوەیەکی روون لەسەدەی شانزەهەم بەدیار کەوتن لەگەڵ فراوان بوون و بڵاوبونەوەی دەسەڵاتی ئیستعمار یەکیچك لەوانەی هانی ئەم تیۆرەی دەدا( خوان جینزد سبولفیدا) ی ئیسپانی بوو لەساڵی ١٥٥٠ دەربارەی سروشتی خەڵکانی ئەمەریکا ئەم رستانەی نووسیوە(ئەمانە مرۆڤی وانین کەخاوەن عەقڵ بن) یاخود (ئەمانە لەگەڵ ئیسپانیە یەکان جیاوازیان هەیە هەروەکو جیاوازی مەیمون لەگەڵ مرۆڤ) ئالێرەدا دەمارگیری نەژادگەری دژی رەشپێستەکان لەگەڵ سەرهەڵدان و پێشکەوتنی بازرگانی کۆیلایەتی فراوانتر بوو، لەم روانگەوە پەنجا ملیۆن ئەفریقی رەوانەی وڵاتە یەکگرتوەکان کران نیوەیان لەرێگا گیانیان لەدەست دا...ئیدی جارێکی تر رەگەزپەرستی لەسەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵدایەوە لەگەڵ قۆناغی دووەمی هێرشەکانی ئیستعمار....ئەم سیاسەتە بەتەنها دژی گەلانی رەش پێست پەیرشەو نەکراوە، بەڵکو لەنێو وڵاتانی ئەوروپاش رەنگدانەوەی هەبووە، بۆ نموونە لەفەرنسا ململانێی نێوان لایەنگرانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی(١٧٨٩) و لایەنگرانی رژێمی کۆن پاڵی بەهەندێ زانا ناوە لەمانە(ئۆگست تیری) بۆ ئەوەی لەکتێبەکەی کەناوی( چەند

نامەیەك لەمێژووی فەرەنسا )یە لەساڵی (١٨٢٧) بڵاوبۆتەوە تیۆرەکی نەژادگەری داڕێژیَ و تیایداهاتووە، فەرەنسا لەرووی سیاسیەوە لەماوەیەکی درێژدا دابەشکراوە بەهۆی پێکهاتەی گەلەکەی لەنێوان دوو نەژاددا یەکێکیان(گالۆ رۆمانیەکانن) کەیەکەمین خەڵکن لەسەر خاکی فەرەنسا نیشتەجیَ بوونە ئەوی تریشیان هێرشکەرانی ئەڵمانین... یەکەمیان لەنێو جوتیارەکانن، بەڵام دووەمیان پەیوەندیان بەچینی ئۆروستوکراتیە هەیە.

شۆڕشی فەرەنسیش درێژخایەنی ئەم ململانیَ یەیە لەنێوان ئەم دوو رەگەزە گالۆ رۆمانیەکان لایەنگری شۆڕشی فەرنسان و بەهۆی سروشتی چینایەتیان پاڵپشتی لەئازادی و دیموکراتی دەکەن، بەڵام ئەوانی تر هەمیشە سەرقاڵی رژێمی ستەم و زۆردارین.

پاشان لەساڵی (١٨٧٤) لەکتێبێکدا ناڕەزایی بەرامبەر یەکسانی کۆمەڵایەتی نێوان خەڵکان دەردەبرشی و دەڵیَ: لەهەموو نەتەوەیەك جیاوازی لەنێوان ئۆرستۆکراتەت و گەلدا هەیە.

ئۆرستۆکراتیەکانی ئەوروپا سەرچاوەیان بۆ رەگەزی ئاری دەگەرێتەوە ئەم رەگەزەش بەگوێرەی سروشتی خۆی دەسەڵاتدارەو داهێنەری شارستانیەت و مەدەنیە، هەر ئەم رەگەزەش بۆتە هێنانە کایەیە رێکخستنی سیاسی و بیروهونەرو رۆشنبیری و پێشکەوتن بۆ ئەوروپا، بەڵام گەل لەچەند نەژادێکی لاواز پێکهاتووەو هەر لەسەرەتاوە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی رەگەزی ئاری.

لەراستیدا نەژادگەری لەنێوەندەکانی فەرەنسی و بەریتانی سەری هەڵدا پاشان بۆ ئەڵمانیا گواسترایەوە و لەم وڵاتەش زۆر بەقووڵی گرنگیان پێداو پێشیانخست، ئەوانەی لەم بوارەوە کاریان کرد(فیختە) ی فەیلەسوف بوو لەکۆمەڵە وتارێکی کەئاراستەی گەلی ئەڵمانیا کرد لەماوەی داگیرکردنی ئەڵمانیا وە لەلایەن ناپلیۆن جەختی دەکرد کە گەلی ئەڵمانیا تاکە گەلێکی زیندووە کەتوانیویەتی زمانەکەی بپارێزێ بەرامبەور بەمەش زمانەکانی تری ئەورووپی نامۆن و پێویستە لەسەر گەل بەرەنگاریان بێت و لەناویان بەرێت، لەم سۆنگەوە بیرو دیدو بۆچوونەکانی (فیختە) لەژیانی سیاسی ئەڵمانیا رۆڵێکی بەرچاوی گێرا، لەم بارەیەوە (گلیۆمی دووەمی) قەیسەری ئەڵمانیا لەو پەری هێزو دەسەڵاتداریدا دەیگوت (ئێمە خوێی زەوین دروستکراوین بۆ ئاوەدانکردنەوەو بەشارستانیەت کردنی جیهان. واپێدەچێ گۆرانکاریەکی گەورە لەپێشکەوتنی تیۆریەکانی نەژادگەری لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر دەستی (هۆستن ستیورات) ی نووسەری ئینگلیزی (١٨٥٥-١٩٢٧) هاتبێتە دی. ئەم نووسەرە لەرێگای کتێبەکەی بەناوی (بنەماکانی سەدەی بیستەم) ئەفسانەی گەلی ئاری بەکار هێنا بۆ بەرزکردنەوە و زیندووکردنەوەی ئەڵمانیەکان. پێ ی وایە ئارییەکان نەك چینێکی ئۆرستۆکراتین بەڵچکو نەتەوەیەکن، کەنەتەوەی ئەڵمانیایە.

ئەڵمانیەکان پشتیان بەتیۆریەکانی ئەم نوسەرە بەست وەك پاساوێك بۆ داگیرکردن و فراوانکردنی سنوری وڵاتیان( گلیۆمی دووەمی) قەیسەر مەدالیای خاچی ئاسنینی پێ بەخشی و (هیتلەر) لەساڵی (١٩٢٣) بایەخێکی گەورەی پێدا بەر لەنووسینی کتێبە ناودارەکەی بەناوی(کفاحی) .

نازییەکان بیرو باوەری نووسەریان کردە بناغەیەك بۆ بنەمای بیری سیاسیان پاش ئەوەی چەند گۆرانکاریەکیان تیادا هێنایە دی. ململانێی ی نێوان ئۆرستۆکراتیەت و گەلی نا ئاریان گۆری بۆ ململانێی لەنێوان یەهود و نایەهودیەکان بەمانایەکی تر گەلێك کە بۆ نەژادێکی بەهێزو بەتوانا دەگەرێتەوە لەگەڵ نەژادێکی کزولاواز، بەهەر شێوەیەك بیت هەولچ دەدا ژیان وپێکهاتەی یەکەم لەناوببات. لێرەدا بەدیار دەکەوێ کەهەڵویست و بزوتنەوەکانینەژادگەری رۆلێکی مەزنیان لەمێژووی مرۆڤایەتی بینیوە، ئەمەشیان لەپەیوەندیەکانینێوان رەگەزەکان و گەلان یاخود لەململانێ ی نێو هێزە کۆمەڵایەتیەکانی جیاوازی وڵاتێك بەدیار دەکەوێ.

گومانی تیادا نی بیرۆکەی بەرزکردنەوەی نەژادێك دژی ئەوی تر لەبنەڕەتەوە پەیوەندی بەچەوساندنەوەو ستەم وزۆرداریەوە هەبووە، هەروەها پەیوەست بووە بەدەسەڵاتی ئیستعمار لەهەمان کاتیش هەوڵدانێك بووە بۆ ئەوەی گەل لەگیروگرفتەکانی سەرەکی کەپەیوەندی بەژیان و مانوەی هەبووە دوور بخرێتەوە. لەسەدەی شانزەهەم و

لەقۆناغی یەکەمی دەسەڵاتی ئیستعمار وڵاتانی ئەوروپا پروپاگەندەیان بۆ جیاوازی رەگەزایەتی دەکرد لەپێناو چەوساندنەوەی گەلانی تر، ئەمانە لەماوەی قۆناغی دووەمی ئیستعمار لەسەدەی نۆزدەهەم وبیستەم بۆ جارێکی تر و سەرلەنوێ بڵاوبوونەوە. لەکۆتاییدا لێکۆڵینەوەکانی زانستی بیروبۆچوونی تیۆریەکانی نەژادگەری پوچەڵ کردۆتەوەو روونیشی کردۆتەوە کە هیچ بنەمایەك زانستی بۆ جیاوازی لەنێوان رەگەزەکانی مرۆڤایەتی دا نیەو ئەگەر بەدیاریش بکەوێت ئەوە بۆ سروشتی مرۆڤایەتی ناگەرێتەوە، بەڵکو پەیوەندی بەبارودۆخی کۆمەڵایەتی و ژینگەو چەند هۆیەکی تری مرۆڤی یەوە هەیە.

## کورتە باسێك دەربارەی مێژووی حزبە سیاسیە کۆنەکان

کۆمەڵگەکانی پێشوو لەزۆربەی کاتدا مل کەچی ستەم و زۆرداری بوونەو دەسەڵاتی پاشاکان یرۆز بووە، گوایە لەلایەن خواوە نێردراون دەبێت بەم شێوەیە حوکم بکەن، بۆ ئەمەش دەسەڵات سەپێندرا بوو مرۆڤی ئەوساش نەیدەتوانی بەرانبەر بەم حاڵەتە هەنگاوێکی شیاو پەیڕەو بکات، پێویست بوو فەرمانەکان و ئامۆژگارییەکانی دەسەڵاتی سیاسی جێبەجێ بکات، کەچی روون و ئاشکرایە دەسەڵاتی پاشاکان گوایە بەهایەکی پیرۆز و کارێکی بەنرخە و فەرمانەکان لەخواوە وەردەگرن بەدیار کەوت بنچینەیەکی راستی نەبووەو پلانێکی دارێژراوبووە.

لەبەر ئەمەش کۆمەڵگای کۆن چەند شیچوازێکی لەدەسەڵاتی پادشایەتی رەها بینیوە ، بۆ نموونە میسر کاتی فەرعەونەکان فەرعەون وای نیشان دەدا کەخوایەو دەبێت بیپەرستن، هەروەهالەوڵاتانی هیندستان و چینیش ئەم جۆرە دەسەڵاتە هەبووە، بۆ ماوەیەکی زۆر گەلی ئەفسانەو کاریگەری دوور لەراستی دەسەڵاتی بەسەر ئەم کۆمەڵگایانە سەپاندبوو لێرەشدا ئایین کاریگەرییەکی قوڵی بەسەر خەڵکدا هەبووە خەڵکیش بەشێوەیەکی رادەبەدەر خولیای ئایین بوون هەر لەبەر ئەم هۆیەشە پیاوانی ئایینی شوێنێکی دیاریان لەناو خەڵکدا پەیدا کردبوو دەسەڵاتیان تا دەهات بەرەو زیادبوون دەچوو.

ئینجا لێره حاكمی ئەو سەردەم ئاینیان دەكردە بیانوویەك بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان پەرەپیچ بدەن و درێژخایەن بكەن، بەدرێژایی كاروانی ژیانی مرۆڤایەتی هەمیشه دوو هێز لەئارادابوونه یەكێكیان كۆن و بەرو نەمان دەڕوات ئەوی تریشیان نوێیەو لەگەشەدان دایه، بەڵام هەر دەمێنێتەوه وەكو ئایین كەتووشی لاوازی و كزی دەبێت كەچی هەر بەزیندویی دەمێنێتەوه كاری راستەوخۆ و ناراستەوخۆی بەسەر كۆمەڵدا بەردەوام دەبێت.

ئەغریقیەكان ئەو كاتەی دیموكراسیەتی (شار) یان هێنایه كایەوه بەسەركەوتنێكی گەوره لەقەڵەم درا، هەرچەنده ئەم دیموكراسیەته دابڕاو لاواز بوو لەبەر ئەوەی ئەم دیاردەیه گشتی نەبووەو هەموو كەسێكی نەگرتۆتەوه كۆیلەكان مافی ئەوەیان نەبووه بەشداری لەبەرێوەبردنی كاروباری (شار) بكەن، ئافرەتیش لەو مافه بێبەش بووه. مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوه كەفەیلەسووفەگەورەكانی ئەسینا باوەڕیان بەدیموكراسیەت نەبووه، تەنها سوقرات نەبێ زۆربەی كات فەیلەسووفەكان دژی دیموكرایەت وەكو رووكەشێك باڵی بەسەرئەسینادا كێشابوو، بەڵام چینی ئۆرستۆكراتیەت بەتەواوی دەسەڵاتی بەسەر شار داگرتبوو شارەكانی یۆنانی دابەش كردبوونه سەر دووچین چینی ئۆرستۆكراتیەكان وچینی هەژارەكان . هەر لەم بارەیەوه (ئەرستۆ) كاتێ وەسفی كۆمەڵگای ی یۆنانی دەكات ئاماژه بۆ ئەوه دەكاتكه ئەم كۆمەڵگایه لەدوو شار پێك دێن شاری هەژاران

و شاری دەوڵەمەندان(ئەرستۆ) هەر بەمەیش نەوەستاوە بەڵکو هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی بۆ هەژاری گەڕاندۆتەوەو سەبارەت بەپەیوەندی نێوان هەژاری و شۆڕش دەڵێ(هەژاری دایکی شۆڕشەکانە) ئەم بارودۆخەی ئەغریقیەکان کاریگەری خۆی پەیدا کرد لەمەڕ بەدیارکەوتنی هەندێك حزبی سیاسی لەمانە حزبی(چیا بەرزەکان) هەڵوێستی ئابووری بەسەر بیروباوەرەکانی زاڵ بوو، حزبی (دەشت) هەڵویستی پارێزگاران بوو کەچی حزبی (کەنار، سیاسەتی لەنێوان رادیکالیەت و پارێزگاران بوو) سیاسەتی ئەم سێ حزبەش تەنها بەکاریگەری ئابووری نەبەسترابۆوە ، بەڵکو چەند هۆکارێکی تریش هەبوون وەکو جیوازی نێوان دانیشتوانی کۆن ونوێی شاری ئەسینا هەروەهاجیاوازی نێوان هاولاٌتیانی یۆنانی و ئەو بیانیانەی سیفەتی هاولاٌتیان وەردەگرت ، جگە لەمانەشجیاوازی نێوان خێزانەکان و ئەو هۆزانەی کۆمەڵگای (ئەسینا) یان پێك دەهێنا. حزبە سیاسیەکانی ئەسینا رێکخستنێکی ئەوتۆیان نەبوو، هەروەك حزبەکانی ئێستا بەرانبەر بەمەش نوێنەری چەند لایەنێك بوونەو رۆڵی خۆیان لەژیانی سیاسی دەگێرا، بیرۆکەی دامەزراندنیان بۆ کەسایەتییەکی سەربازی یاخوود سیاسی دەگەرێتەوە. لای رۆمانیەکان دیموکراسیەت شوێنێکی دیاری ئەوتۆی نەبووە بەهۆی ئەوەی سروشتی رۆمانییەکان وەهەڵ کەوتبوو کە زۆر جار بایەخیان بەتیۆری سیاسی نەدەدا و سەربازی جەنگ بوون وزۆربەی کاتیش خەریکی شەڕوشۆڕ بوون ، هەروەها

رایان وابوو گەل لەچەند چینێکی ژێرەوە پێکهاتووە، ئەم تێڕوانینەو گەلێچ هۆکاری تر بوونە هۆی هەڵگیرسانی ململانێ وکاری توندوتیژی و بەدیار کەوتنی بزوتنەوەی سیاسی دژی چینی فەرمانڕەوا(دۆما) ش بەش بەحالێ خۆی هەندێك حزبی سیاسی تێدا هەڵکەوت لەمانە حزبی (گەورەکان) و (دیموکراتی ) و(کۆماری)... عەرەبەکانیش لەبارەی دیموکراسیەت و حزبی سیاسی پەیوەستیان لەگەڵ ئەم کارانە زۆر لاواز بوە، دیموکراسیەت لەژیانی عەرەبەکان زۆر کەو دەتوانین بڵێن هەر نەبووە، چونکە خێزان یاخوود هۆز بناغەی ژیانیان بووە، بۆیە حزبی سیاسی لەنێوانیاندا هەر نەبووە، ئەمەیان پێش سەرهەڵدانی ئاییینی ئیسلام بووە بەڵام ئەو کاتەی ئاینی ئیسلام وەك شۆرشێك چەند گۆرانکاریەکی قووڵی بەسەر ژیانی عەرەبەکان هێنا، بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) دوو لایەن هەبوون (حزب الله) ئەو کەسانەی ئیمنداربوون(حزبی شەیتانیش) پەیوەندی بەکافرەکانەوە هەبووە کۆمەڵەی یەکەم باوەڕی تەواویان بەئاییینی نوێ هەبووە، کۆمەڵەی دووەمیش هەموو هێزێکیان بەکار دەهێنا دژ بەئاییینی نوێ.

کاتی حوکمڕانی خەلیفە عومەری کوری خەتاب هیچ حزبێکی سیاسی نەهاتۆتە کایەوە بۆ ئەوەی دژایەتی دەسەلاتی خەلیفەکان بکات، بەلام لەحوکمڕانیەتی خەلیفە عوسمانی کوری عەفان ناکۆکی زۆر پەیدابووە لەسەر بابەتب دەسەلات و کێ مافی ئەوەی هەیە

ببێته(ئیمام) کەچی سەردەمی خەلیفە عەلی کوری ئەبوو تالْب هەندێك کۆمەڵەی سیاسی ئیسلامی پەیدابوون، ئەم کۆمەڵانەش حزبی سیاسی بوون لەبەر ئەوەی هەوڵیان دەدا بگەنە دەسەڵاتی سیاسی هەروەها لەبارەی رێکخستن و کاری حزبایەتی زۆربەهێزبوون... ئەوروپاش رێکخراوی سیاسی زۆری بەخۆیەوە بینی بەڵام جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ حزبی سیاسی ئێستا هەبوو، بۆنموونە لەبەریتانیا کە مەڵبەندی پەرلەمانەپەرلەمان هۆیەکی کاریگەربوو بۆ بەدیارکەوتنی حزبی سیاسی ، دوو حزبی سیاسی لەئەنجوومەنی گشتی کاریان دەکرد یەکێکیان پشتیوانی لەپاشا دەکرد ئەوەی تریشیان پالْپشتی لەپەرلەمان و داکۆکی لەگەڵ دەکد.... زۆربەی نووسەرەکان لەو باوەڕەدان لەکۆتایی سەدەی حەڤدەهەم حزبی سیاسی لەبەریتانیا لەدایك بووە.

لەفەرەنساش پەیدابوونی حزبی سیاسی کارێکی نوێیە چونکە تاناوەڕاستیسەدەی نۆزدەهەم حزبی سیاسی بەمانای تەواو نەبوو جگە لەمەش شۆڕشی فەرەنسی حزبی سیاسی رێك و پێکی بەخۆیەوە نەگرتبوو هەرچەندە کۆمەڵەی لەنێودا هەبوو وەکو کۆمەڵەی (چیاکان و جیروندەکان) یەعاقبەکانیش وەك حزبێکی سیاسی نەبوون بەڵکو ئەندام بوون لەیانەیەك.

هۆیەکانی سەرهەڵدانی حزبی سیاسی زۆرن لەمانە هۆکاری ئابوری و کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسی جگە لەمانەش بیروباوەڕو نەریت و

جیاوازی ئایینی و ڕەگەزی کاریگەری تەواویان هەیە بۆ پەیدابوونی حزبی سیاسی هەروەها ستەم وزۆڵمی دەسەڵاتی سیاسی کەلەلایەن کەمایەتیەکەوە بەکار دەهێنرێن دەبێتە هۆیەکی تر.

گومانی تێدانی یە حزبی سیاسی لەهەر شوێنێك بێت رەنگدانەوەی بارودۆخی ئەم کۆمەڵگایەیە کەتیایدا سەرهەڵدەدات و هەمیشە بەبەردەوامی هەوڵ دەدا بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی.

# پێکهاتەی حزب لەئەوروپا و
# وڵاتانی جیهانی سێیەم

گومانی تێدانیە حزب لەهەر کۆمەڵگەیەکدا سەرهەڵبدات رۆڵێکی ئەوتۆ لەژیانی گشتی دا دەگێرێت لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی .... پێکهاتەی حزب رەنگدانەوەی باری ئەو کۆمەڵگایەیە کەتیایدا لەدایك دەبێت بەڵام وەك دیاردەیەکی مێژوویی جیاوازی لەنێوان ژیانی سیاسی وڵاتانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەدی دەکرێت بەتایبەتی دەربارەی پێکهاتەی حزب و شێوازی ململانێ و بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی لەتوانادا هەن بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی سیاسی — لەکۆنەوە ئەوە سەڵمنراوە کە ئەو حزبەی هەوڵی بەدەستهێنانی سیاسی لەقەڵەم نادرێت چونکە پێویستە لەرێگای دامو دەزگاکانی دەوڵەتەوە توانا و ئەزموونی خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی کارکردندا تاقی بکاتەوە....

لێردا پێویستە ئاماژە بەهەندێ پێناسە بکەین سەبارەت بەحزب و ژمارەیەك لەپشپۆرو شارەزاو مامۆستایانی زانکۆ لەو باوەڕەدان کە حزب (جۆرە یەکگرتنێکی کۆمەڵە خەڵکانێکە کەبنەما سیاسیەکان لێکیان نزیك دەخاتەوە...

یان (کۆمەڵە خەڵکێك بەهۆی کارکردنی هاوبەشیان هەوڵ دەدەن بەرژەوەندیەکانی گشتی جێبەجێ بکەن بەپێی بناغەیەك کەهەموویان لەسەری رێکەوتوون ).

یاخوود حزب(ئەو ڕێکخراوەیە لەڕێگای ڕاوبۆچوونی هاوبەش لەیەکتر نزیك دەبنەوە بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی گەورە بخاتە سەر گارگێری گشتی ).

حزب (ئامرازێکە بۆدیموکراسییەتی نویٚ).... پێکهاتەی حزب لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی هەیە... لەژمارەیەك لەوڵاتانی رۆژئاوا دیاردەی هەڵبژاردن هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ سەر هەڵدانی حزبە سیاسیەکان و کۆتایی هێنان بەحوکمی تاکڕەوی کە ماوەیەکی درێژ ئەم وڵاتانەی گرتبۆوە، بەڵام پاش ئەوەی دیموکراسیەت لەئەوروپا و ئەمەریکا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەدیارکەوت کە پەرلەمان ناتوانێت گوزارشت لەم سیستەمە بکات بەتەنها لەکاتی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان نەبێت.

بەم هۆیەوە (جان جاك رۆسۆ) نووسەرو ڕووناکبیری فەرەنسا هێرشی کردە سەر سیستەمی پەرلەمانی ئینگلتەراو لەمبارەیەوە دەڵێ (گەلی ئینگلیز پێی وایە ئازادە، بەڵام لێرەدا بەهەڵە داچووە تا هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان ئازادە دوای ئەم پرۆسەیە دەبێتە کۆیلە یان هیچ شتێکی لەدەستدا نامێنێت). سەرەرا ئەمەش سیستەمی حوکمڕانیەت لەوڵاتانی رۆژئاوا لەڕێگای هەڵبژاردنەوە بەڕێوەدەچێت کە ڕێگایەکی یاسایی و ئاشتیە بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی سیاسی بەم هۆیەوە ململانێی حزبە سیاسیەکان لەپێناو جەنگی هەڵبژاردنە، لەکۆتاییدا حزبی سەرکەوتوو دەبێتە حزبی فەرمانڕەواو حزبی دۆڕاویش دەبێتە حزبی

بەرهەڵستکار، ئەم دیاردەیە لەبەریتانیاو ولایەتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا زۆر بەزەقی بەرچاو دەکەوێت، ژیانی سیاسی لەم وڵاتانە داخراوو نهێنی نیە، بەڵکو بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجام دەدرێت دیموکراسیەت رۆژئاوا باوەڕی بەئازادی گشتی و مافەکانی تاك هەیە و ئەم ژیانە بۆ دیموکراسی و حزبەکان دەگەرێتەوەو دیموکراسیەت بەبێ دیموکراسی بوونیان نیە... لێرەدا بەدیار دەکەوێت کە حزبە سیاسیەکان رۆڵێکی بەرچاویان گێراوە بۆ هێنانەدی دیموکراسیەت.... بەپێچەوانەی ئەمبارە .. حزب و ژیانی سیاسی لەوڵاتە تازە پێشکەوتووەکان جیاوازیەکی گەورەی هەیە ئەگەر بێتو بەراوردبکرێت لەگەڵ ژیانیسیاسی ووڵاتانی رۆژئاوا .... ژیانی سیاسی لەزۆربەی ووڵاتە تازە پێگەیشتووەکان نائارامی و ناسەقامگیری پێوە دیارە ململانێی بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسیو ئابوری کاریگەرییەکی گەروە دەخاتە سەر قوڵبوونەوەی ناکۆکی و جیاوازی دەرەنجام بەکودتای سەربازی یان دیکتاتۆریەت کۆتایی پێ دێت. ... دیاردەیەکی زەق و ئاشکرا پەیوەستە بەزۆربەی رژێمەکانی ئەم وڵاتانە ئەویشیان دەزگای سەربازییەکە کۆنترۆڵی سەرجەم لایەنەکان دەکات... چەندین هۆکار بوونەتە سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە لەمانە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و لاوازی رۆڵی دامودەزگاکانی دەوڵەت و سستی لایەنەکانی هزری و رۆشنبیری و نەبوونی دامودەزگای کارگێری کاریگەر وێرای بڵاوبوونەوەی دەمارگیری و زاڵبوونی هەستی عەشایری

و خێڵەکی....بەپێویست دەزانرێت کەتیشك بخرێتە سەر لایەنەکانی هزری و رۆشنبیری. بێگومان رۆشنبیری رۆڵێکی گەورە لەژیانی میللەتان دەگێرێت ... ئاشکرایە کەهەموو میللەتێك خاوەن رۆشنبیریەکی تایبەتە هەرچەندە هزرو بیری مرۆڤایەتی یەك سەرچاوەیە لەرووی هزریەوە پێویستە کراوە بێت و بەبەردەوامی بیروبۆچوونی نوێ قەبوڵ بکات بەمەرجێك لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی نەتەوە بگونجێت خۆ دوورخستنەوە و گۆشەگیری لەم لایەنەوە پێویستە هەموو گەلێك لەهەوڵی بەردەوامدا بێت بۆ زیندووکردنەوەی بوارەکانی رۆشنبیری.

ئەمەشیان لەرێگای سوود وەرگرتن لەکەلەپووری شارستانیەت دێتە دی سەرە ڕای ئەمەش سەرجەم میللەتەکان تایبەتمەندو خاوەن کەلەپووری خۆیانن.... شۆڕشی رۆشنبیری فاکتەرێکی گرنگە بۆ گەشەسەندنی کەلەپوورو بنەما رەسەنەکانی هەموو گەلێك لەپێناو چارەسەرکردنی بیروبۆچوونی هەڵە بەسەر چوو رۆشنبیری پردێکە بۆ بەستنەوەی ئێستا بەرابردوو بەبیروهزری مرۆڤایەتی روو لەکرانەوە دەکات... رۆشنبیری سیاسی زۆر پێویستە بۆ جەماوەر چونکە کاروانی دیموکراسی پەیوەستە بەرۆشنبیری سیاسی جەمتوەرو پابەندە بەزانیاریەکان وێرای پەیوەندی بەگەشەسەندنی ئابورییەوە...ئەگەر بێتو زۆربەی رۆڵەکانی گەلێك نەخوێندەوار بن ئاوا توانای گۆڕین و کراوەیان روو لەلاوازی دەکات لەئاکامدا ئەگەر جەماوەر لەرۆشنبیری و گەشە سەندنی ئابووری بێ هێزبن لەدەسەلات و کارکردنی ژیانی سیاسی دوور

دەکەنەوە گرنگی رۆشنبیری هەر گەلێك کاریگەرییەکی فراوان دەخاتە سەر چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان بەم شێوەیە نزمی ئاستی رۆشنبیری لەزۆربەی ولآتە تازە پێگەیشتوەکان زەمینەیەکی لەباری خولقاندووە بۆ زالّبوونی رژێمی دیکتاتۆریەت و لەزۆربەی کاتیشدا دەسەلآتی سیاسی و ئابووری خراوەتە ژێر دەستی کەمینەیەك کەئامانجی سەرەکیان کۆکردنەوەی پارەو بەهێزکردنی لایەنی سەربازییە لەپێناو مانەوەو درێژەدان بەحوکمی تاکڕەوی. (دانتۆن) کەیەکێکە لەسەرکردەکانی شۆڕشی فەرەنسا بەم شێوەیە گوزارشت لەرۆشنبیری دەکات(دوایی نان مەعریفەت پێویستی یەکەمی گەلە).

## پارتەسیاسیەکان و دیموکراسیەتی رۆژئاوا

بێگومان پارتی سیاسی لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە، بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا رەنگدانەوەی بارودۆخی ئەم کۆمەڵەیە کە لەناویدا سەری هەڵداوە .

لێرەدا بەپچویستی دەزانیین ئاماژە بۆ رۆڵی پارتەسیاسیەکان لەدیموکراسیەتی رۆژئاوا بکەین کە دیاردەی هەلچبژاردن هۆیەکی تر بوو بۆ پەیدابوونی پارتە سیاسیەکان بەزۆریش بناغەیان بۆ لیژنەکان دەگەرێتەوە .

مێژووی ململانێی نێوان دیموکراسیەت و فەرمانرەوای رەها ماوەیەکی چاکی خایاند تا ئەو کاتەی دیموکراسیەت بەسەریدا زاڵ بوو، بەتایبەتی لەئەوروپا و ئەمەریکا پاشان ەدیارکەوت ئەو هێزو توانایەی لەرێگای پەرلەمانەوە بەدی هاتوون گوزارشت لەویست و ئارەزووەکانی گەل ناکەن. ئەوەیشیان لەبەر هۆیەکی سادە چونکە گەل بەگوێرەی دەستورەکانی ولآتانی پەرلەمان ناتوانێت و بۆی نیە گوزارشت لەویست و ئارەزووەکانی گەل ناکەن، ئەوەیشیان لەبەر هۆیەکی سادە چونکە گەل بەگوێرەی دەستورەکانی ولاتانی پەرلەمان ناتوانێت و بۆی نیە گوزارشت لەراکانی خۆی بکات، تا کاتی سازدانی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لەم بارەیەوە(جان جاك رۆسو) ی نووسەری فەرنسی ناودار لەسەدەی هەژدەیەم هێرش دەکاتە سەر رژێمی پەرلەمانی بەریتانیاو دەڵێت گەلی ئینگلیز پێی وایە ئازادە، بەڵام لێرەدا بەهەڵە داچووە تا

هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان ئازادە دوای ئەم پرۆسەیە دەبێتە کۆیلە یان هیچ شتێکی لەدەستدا نامێنێت).
روسۆ لەم روانگەیەوە داوای چاکسازی و راست کردنەوەی دیموکراسیەت دەکات بۆ ئەوەی ببێتە دیموکراسیەتێکی راستەوخۆ.
هەڵبژاردنەکان خالچ یێکی سەرەکی ژیانی رژێمەکانی رۆژئاوایە و لەرێگەی دەنگدانی گشتی ئەنجام دەدرێت، بەرای وان رێگەیەکی شەرعی و ئاشتییە بۆ ئەوەی بە دەسەڵات بگەن. پارتەسیاسیەکان ململانێیەکی توندیان لەنێواندا دێتە کایەوە کاتێك لەدەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان پارتی سەرکەوتوو دەبێتە پارتێکی فەرمانڕەوا و پارتی دۆراویش دەبێتە بەرهەڵستکار، ئەم دیاردەیە لەبەریتانیاو ئەمەریکا زۆربەزەقی دیارە لێرەدا ژیانی سیاسی لەرۆژئاوا لەسەر بناغەیەك بەرێوەدەچێت ، گوایە ململانێی سیاسی دەبێت ئاشکراو کراوەبێت، نەك نهێنی و داخراوبێت . بەرهەڵستکاران رۆڵێکی چاك دەگێرن بۆ ئەوەی پارتی سەرکەوتوو لەسنوری خۆی لانەداو پابەندی جێبەجێکردنی بەرنامەکەی بێت، ئەو بەرنامەیەی لەکاتی هەڵبژاردن پروپاگەندەی بۆ دەکرد، جگە لەمەش دیموکراسیەتی رۆژئاوا باوەڕی تەواوی بەسەربەستیە گشتیەکان و مافەکانی تاکە کەس هەیە، هەر لەبەر ئەوەش ژیانی سیاسی لەکۆمەڵگاکانی رۆژئاوا بەدوو شت بەندن یەکێکیان دیموکراسیەتەو ئەوی تریشیان پارتەکانن، لەدیدوبۆچوونی ئەوان دیموکراسیەت بوونی نییە بیچ پارتەکان، هەروەها پارتەکانیش

بوونیان نییە بێ دیموکراسیەت. گومانی تێدانییە پارتە سیاسیەکان رۆلێکی بەرچاووشیاویان لەدامەزراندن و پێکهاتنی رەگ و ریشەی دیموکراسیەت گێراوە، ئەوەیان راستیەکە ، بەلاّم راستەیکی تر هەیە کە پەیوەستە بەسەرمایە کە فشارو پالّەپەستۆیەکی گەورەو بەهێز دەخاتە سەر ژیانی سیاسی کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا، خاوەن سەرمایەکان لەزۆربەی کەسانی تر سەربەست و ئازادترن، لەئاکامدا دەسەلاّتی سیاسی لەرۆژئاوا کەوتە ژێر دەستی دەستەیەك یاخود چینێك جگە لەمانەش دوای جەنگی جیهانی دووەم پارتە سیاسیەکان رۆلّیان کەم بۆوە بەتەنها پارتە گەورەکان لەگۆرەپان مانەوەو سەندیکاکانیش کاریگەریەکی گەورەیان لەمەڕ سیاسەتی رۆژئاوا هێنایە کایەوە، هەروەها بارودۆخی دوای جەنگ کارێکی زۆری لەسەر ئەوە کرد، کەدەسەلاّت ببێتە مەرکەزی ، چونکە جیهانی دوای جەنگ و پێشکەوتنی شۆڕشی زانستی و سەرەرشای ئەو گیروگرفتە کۆمەلاّیەتیانەی کە کۆمەڵگای رۆژئاوا بەتوندی هەژاند، ئەمانە وایان کرد دیموکراسیەت و پارتە سیاسیەکان توانای ئەوەیان نەمێنێت وبیست و ئارەزووکانی گەلانی رۆژئاوا بهێننە دیز

ئینجا لێرەدا ئەو پێشکەوتنە زانستیە گەورەی کە گۆرانکارییەکی زۆری لەسەر کۆمەڵگای رۆژئاوا کرد جگە لەو هۆکارانەی هاندەربوون بۆ ئەوەی دەسەلاّتی یاسادانان ببەزێنێت.

هەرچەندە لەدیموکراسیەتدا پێویستە دەسەڵاتی یاسادانان باڵادەست بێت تاوای لێهات دیموکراسیەت لەفەرەنسا دووچاری شکستی بێت ، هەروەکو پێشتر ئەڵمانیا و ئیتالیا دووچاری هاتبون، وێڕای ئەمانەش رۆڵی راگەیاندن بەدیار کەوت لەم رێگەیەوەش پەیوەندی کۆنی نێوان جەماوەرو دەزگاکان هەرەسی هێنا، بەمەش دەسەڵاتی سیاسی چەکی نوێی هێنایە کایەوە ، بۆ ئەوەی بتوانێت لەم رێگەیەوە کاریگەرییەکی گونجاو بخاتە سەر مێشك و دەروونی ئەو خەڵکانەی متمانەو باوەڕیان بەدەسەڵات و پارتە سیاسیەکان کەم دەبێتەوە.

## بەدیار کەوتنی پارتەسیاسیەکان لەجیهانی سێیەم

بێگومان سەرهەڵدانی پارتە سیاسیەکان لەجیهانی سێیەم جیاوازیەکی گەورەی لەگەڵ وولاّتانی رۆژئاواو وولاّتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەیە، زۆربەی پارتەکان لەدەرەوەی پەرلەمان و لەسەر ئاستی جەماوەری پەیدابوون ، بۆ نموونە بەدیار کەوتنی پارتی گۆنگرەی هێدی و کۆمنتانگی چینی و پارتەکانی تری ژاپۆن بۆ هۆکارەکانی ناوەخۆو پێش کەوتنی مێژوویی گەورە دەگەرێنەوە، کە زۆر جیاوازن لەگەڵ بارودۆخی ولاّتانی رۆژئاوا.

لەبەر ئەمەشە ئەم پارتانە سەبارەت بەپێکهاتەو کارکردن و ئامانجەکانیان جیاوازییان لەگەڵ جیهانی رۆژئاوا دا هەیە، کاتی خۆی هێزەکانی ئیستعماری چەند بنکەوئەنجوومەنی نوێنەران و پەرلەمانی پێکهێنابوو وەك دیاردەیەکی رووکەش دەربارەی سیاسەتی ناوەخۆو دەرەوەی کەچی بزوتنەوەکانی نەتەوەیی لەزۆربەی حاڵەتدا ئەم رەفتارەیان رەت دەکردەوە و رازی نەدەبوون لەژێر دەسەلاّتی پەرلەمانێکی دەستکردو ئامادەکراو کاربکەن، بزوتنەوەی نەتەوەیی لەهیندستان گەشەی سەندو بوژایەوە، پێش دامەزراندنی پەرلەمانی وولایەتەکانی هیندی و بەردەوامیش بەشداربوونی لەنێو ئەم پەرلەمانە رەت دەکردەوە، چونکە دەستکردی دەسەلاّتی بێگانە بوو بۆ ئەمەش بزوتنەوەکە فراوانتربوو و بووە بنکەیەکی جەماوەری گەورە.

هێزەکانی بێگانە هەمیشە رێگایان لەم وولاَتانەە دەگرت بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی رزگاری هەر لەبەر ئەمەش زۆر لەبزوتنەوەکانی نەتەوەیی کاری نهێنیان گرتەبەرو وەك رێکخراوێکی سەربازی دەهاتنە بەرچا هەندێك لەوولاَتانی ئاسیاو ئەفریقیا ئەم شێوەیان بینیوە پارتی کۆمنتانگ لەچین لەسالاَنی بیستەکان لەلایەن ئەنتلجنسیاوە هاتەکایەوە ، بەبەردەوامیش هەولَی دەدا وەك هێزێکی و سەربازی لەزۆربەی ناوچەکانی چینی کارەکانی ئەنجام بدات خالێکی تری ئەم باسە لەوەدایە جیهانی سێیەم پێش ئەوەی پارتە سیاسیەکانی تیا هەلَکەوێت زۆربەیان کەوتبوونەتە ژێر دەسەلاَتی ئیستعماری و دەرفەتێکی ئاوایان بۆ نەرەخساوە بۆ ئەوەی ژیانی پەرلەمانی ببینن و پاشانیش وردە وردە ببێتە هۆی پەیدابوونی پارتە سیاسیەکان لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین ئەو پارتانەی دامەزراون لەسەر ئاستی جەماوەری دووچاری رکابەرایەتی پارتی نەبوینەتەوە ئەمەش وای کردووە، ململانێیەکی توند لەسەر کێشەی دەسەلاَت بێتە کایەوە.

هەندێك ولاَتانی ژێر دەسەلاَتی ئیستعماری بەریتانی لەمانە هیندو کینیا و ئۆگەندا و نێجیریا و بۆرما و سریلانکا سیستەمێکیان لەنێودا باو بووە بۆ بەشداربوونی نیوەی دەسەلاَتی سیاسی لەنێوان ئیدارەی ئیستعماری و خەلَکانی ئەم ولاَتانە ئەم کردارە پێی دەگوترا (دیارکی) و کاردانەوەی لەسەر ژیانی پارتە سیاسیەکان هەبوو.

ئوم سیستەمە لەنێو بەریتانیا لەسەدەی نۆزدەهەم پەیڕەو دەکرابۆ بەشداربونی هەندێك کەرتی کۆمەڵایەتی بۆ پیادەکردنی سیاسەت و چاودێری کردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا.

ئیدارەی ئیستعماری گەورەترین بەرپرسیەتی لەمەڕ دواکەوتنی ژیانی دیموکراسی ئەم وڵاتانە لەئەستۆدایە، چونکە حوکمێکی بیروقراتی پەیرەو دەکرد جگە لەمەش لەم ووڵاتانە سیستەمی دیاریەکی پیادەدەکراو رێگای بەو خەڵکانە نەدەدا بەشێوەیەکی رێك و پێك ململانێیّ و رکابەرایەتی بەئەنجام بگەیەنن، یاخوود هیچزێك دروست بێت بۆ بەرهەڵستکاری کردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا هەر ئەمەشیان زەمینەیەکی باشی دروست کرد بۆ ئەوەی پارتێك بەتەنها لەسەردەمی سەربەخۆیی دەسەڵات لەئەستۆ بگرێت.

لێرەدا دێینە سەر لایەنێکی تری ئەم باسە ، وڵاتەکانی ئەمەریکای لاتینی بەشێوەیەکی گشتی لەووڵاتانی ئاسیا و ئەفریقیا پێشکەوتووترن و ململانێی پارتە سیاسیەکان لەسەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەزۆر لایەنەوە لەکرداری ململانێیی پارتەکانی ئەوروپا دەچوو. بوارەکانی شارستانیەت و ئایین و ئادلۆژیای سیاسی شێوزازی کارکردنی ئەم پارتانەی پێوەدیاربوو، بەمانایەکی تر ململانێیەکە لەچەند بوارێکەوە خۆی دەنواند لەنێوان ئەم پارتانەی لایەنگیری کەنیسەبوون و پارتەکانی پارێزگار ئەوانەی چینی باڵا لەدێهاتەکان دەستیان

بەسەرداگرتبوو و هەروەها پارتەکانی لیبرالی ئەوانەی لەلایەن بۆرژوازییەکان بەڕێوەدەچوون و بەرنگاری کەنیسە دەبوونەوە.

بزوتنەوەیسۆسیالیستی و چەپڕەوەکان پێش جەنگی جیهانی یەکەم لەنێو چینی کرێکار سەریان هەڵدا، هەرچەندە ئەم بزوتنەوەانە لەزۆر رووەوە لاوازبوون ، زۆربەی بزوتنەوەکان تێدەکۆشان لەپێناو رزگاربوون لەژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی ئەمەریکی و ئیسپانی و وڵاتە ئەوروپییەکانی ترو داوای چاکسازی ئابووریان بۆ گەشەسەندن و ئاوەدانکردنەوەی وڵات دەکرد، لەم بزوتنەوانە بزوتنەوەی بیرۆن لەئەرژەنتین و فارگاس لەبەرازیا و نەتەوەیی شۆرشگێر لەپۆلیڤیا.

ئەم بزوتنەوانە لەگەڵ بزوتنەوەکانی ئەوروپی جیاوازییان هەیە، چونکە بناغەی سەرەکیان بۆ چینی کرێکارو دانیشتووی دێهاتە هەژاریەکان دەگەڕێتەوە ، لەماوە جەنگی جیهانی دووەم روویان لەئادلۆژیای چەپڕەو کردو هاریکاریان لەگەڵ پارتەکانی کۆمەنیستی راگەیاند. دەرئەنجام بەدیار دەکەوێت کە سەرهەڵدنی پارتە سیاسیەکان لەجیهانی سێیەم لەگەڵ وولاتانی ئەوروپا جیاوازیان هەیە نەك هەر ئەمە ، بەڵکو لەنێو ئەم جیهانەش جیاوازی بەدی دەکەین.

## کورتە باسێك دەربارەی حزبی سیاسی و حزبە پارێزگارەکان لەبەریتانیا

پێش هەموو شتێ باهەندێك پێناسەی حزبی سیاسی بخەینە ڕوو بێگومان جیاوازییەکی گەورە بەگوێرەی دیدو بۆچوونی زاناکان وپسپۆرانی زانستە سیاسیەکان بەدی دەکەین(بنجامان کونستان) ڕای وایە حزب (کۆبونەوەی چەند کەسانێکە کە ئامانجی سیاسی یەکیان دەگرێتەوە) بەڵام (هانس کلسن)بەم شێوەیە حزبی سیاسی پێناسە دەکات (حزب کۆمەڵە رێکخراوێکە ئەو کەسانەی تیایدا کاردەکەن چەند رایەکی جیاوازیان هەیە، بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی تەواو بکەنە سەر بەرێوەبردنی کاروباری گشتی ).

لێرەدا رەخنەیەکی توند ئارستەی هەردوو پێناسەکەی سەرەوە دەکرێت چونکە خالێکی گرنگی حزبە سیاسییەکانی فەرامۆش کردووە، ئەویشیان هەوڵدانی زۆربەی حزبەکانە لەپێناو گەیشتن بۆ دەست بەسەراگرتنی دەسەلاتی سیاسی ئیدی لێکۆلینەوەیەکی زۆر لەسەدەی ئێستامان هاتوونەتەدی بۆ پێناسەکردن وژیانی ناوەخۆو سروشت و پێکهاتەی حزبە سیاسییەکان و پەیوەندیان بەئامانجە گشتییەکان و پێشکەوتنی باری کۆمەلایەتی و دوا رۆژیان لەمەڕ ئەو گۆرانکارییانەی دووچاری ژیانی مرۆڤایەتی دەبنەوە... حزب (رێکخراوێکی سیاسییەوململانێیەکی پتەو دەخولقێنێت بەمەبەستی بەدەستهێنانی دەسەلاتی سیاسی) کارکردن و ئامانجەکانی حزبیسیاسی لەولاتێکەوە بۆ

وڵاتێكی تر یاخوود بناغەی ژیان لەوڵاتە پێشكەوتووكان و وڵاتانی جیهانی سێیەم جیاوازییەكی زۆری تێدا بەدی دەكرێت یاخوود حزبی سیاسی (دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیەو پەیوەندییەكی تەواوی بەبارودۆخی گشتیەوە هەیە، لەسەرەتاوە بەشێوەیەكی سادە هاتۆتەدی پاشان بەهۆی چەند گۆرانكارییەك و پێشكەوتنی كۆمەڵایەتیەوە كارەكانی فراوانتربووەو تادێت ژیانی ناوەخۆ و پێكهاتەی بەو ئاڵۆزی دەڕوات هەندێك حزبی سیاسی زۆربەی توێژو چینە جیاجیاكان لەئامێز دەگرێت و گومانیشی تێدا نییە سەرهەڵدانی هەر حزبێك پەیوەستە بەبارودۆخی گشتی ژیانی كۆمەڵگا و كاردانەوەی واقیعی كۆمەڵایەتی ....یان حزب رێكخراوێكی سیاسییە بەشێوەیەكی گشتی لەگەڵ پەیدابون و پێشكەوتنی دیموكراتی سیاسی لەئەوروپای رۆژئاوا و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا سەری هەڵداوە لەئەنجامی دابەش بوونی كۆمەڵگا بۆ چەندەها هێزی جیاواز، بەمەش وەك كارێكی گونجاو پێویست بوو راو بۆچوونە جیاجیاكان كۆبكرێتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو گیروگرفتانەی لەئاكامی ژیانی سیاسی ڕوویان دەدا، لەدواییشدا پێویستی بەئەنجامدانی كرداری هاوبەش بووە.. لەكاتی خوێندنەوەو تێگەیشتنی بەرنامەی حزبە سیاسیەكان پێویستە بەقووڵی و شێوەیەكی فراوان ژیانی ناوەخۆی باس بكرێت نابێت بەتەنها باسی ئەندامەكان و ژمارەی گۆنگرەكانی بكرێت، بەڵكو بەرێبازێكی فرە لایەن هەموو چالاكییەكان و هەڵوێستەكانی بكەوتنە خانەی هەڵسەنگاندن و شی

بکرێنەوە بەمەبەستی هێنانەدی مێژوویەکی راستی رووداوەکان ناوەوەی حزب.... ئەنتۆنیۆگرامیشی لەم بارەیەوە گۆتی... (زۆر پێویستە گرنگی بەو لایەنە کۆمەلاًییەتیە بدرێت کە گوزارشت لەحزب دەکات یاخود ئەو بەشەی زۆر پێشکەوتووە لەنێو حزب بەواتایەکی تر مێژووی حزبەکە بەمانای مێژووی ئەو لایەنە دوورە پەرێزنییە، بەڵکو خاوەن هاورێ و هاوپەیمان و بەرهەڵستکار و دوژمنە لەبەر ئەوە مێژووی حزبێکی دیارییکراو لەکاتی دەستنیشانکردنی دیاردە ئالۆزەکانی ژیانی کۆمکەلاًیەتی و ژیانی دەوڵەت بەدیار دەکەوێت لەوانەشە نووسینی مێژووی هەر حزبێك ببێتە مێژووی گشتی دەوڵەت لەپێناو بەدیار خستنی لایەنێك لەلایەنەکانی بەم هۆیەشەوە حزب گرنگی وشویچنی گەورەیی و بچووکی دەستنیشان دەکرێت بەگوێرەی ئەو ڕۆڵەی لەچالاکی ئەنجامی داوە لەمەڕ بریاردانی مێژووی ئەو دەوڵەتە) . لێرەشدا کورتە باسێکی مێژوویی حزبە سیاسییە پارێزگارەکانی بەریتانیا پێشکەش دەکەین ...مێژووی حزبە پارێزگارەکانی ئەوروپا بۆ سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە... لەبەریتانیا و لەسەدەی حەڤدەهەم رکابەرایەتی کەوتبووە نێوان حزبی (توریز) و(ویکز) جیاوازی و بەرهەڵستکاری ئێستای نێوان حزبی پارێزگاران وئازادیخوازان بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو تابەدیارکەوتنی سەدەی بیستەم وپەیدابوونی حزبی کرێکاران بەمەش

دەسەڵاتی ئەم حزبە پەرەی سەندو کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ژیانی سیاسی بەریتانیا ....

دەسەڵاتی ئازادیخوازان بەهۆی بەدیارکەوتنیکرێکاران کەم بۆوە. بەریتانیاش لەکاتەوە بەململانێی نێوان دوو حزب ناوداری دەرکرد...حزبە پارێزگارەکان لەلایەن چینەکانی دەوڵەمەند بەرێوەدەچوون زۆربەی کارە گرنگەکانیان بەدەستەوە بوو... ناکۆکی نێوان ئەم دوو حزبە گەلیّ هۆکاری لەخۆوە گرتبوو لەمانە ئایینی و ئابوری و هەندێك جاریش دابوونەریتی بنەماڵەکان، چونکە هەر بنەماڵەیەك هەڵوێستی دیاری کراوی هەبوو بەرانبەر گیروگرفتە گشتیەکان بەڵام لایەنی ئایین بەگرنگترین ناکۆکی نێوان حزبەکانی بەریتانیا دەژمێردرێت لەراستیدا ململانێی نێوان(توریز) و(ویکز)ململانێیەکی ئایینیە (توریز) داکۆکی لەکلێسەی ئەنگلیەکانی و دەسەڵاتی پاشا دەکرد، بەرانبەر بەمەش (ویکز) بەرگری لەئازادی وسەربەستی ئایینی و مافەکانی پەرلەمان دەکرد...

لێرەدا ناکۆکیە سەرەتایەك و نیشانەیەك بوو بۆ لەدایك بوونی دووحزبی جیاواز ، یەکێکیان بەرهەڵستی ئەوی تریانی دەکرد(توریز) بەرگری لەبەرژەوەندیەکانی پاشا دەکرد کەچی حزبی(ویکز) یش داکۆکی لەبەرژەوەندیەکانی گشتی دەکرد...

بەمەش بووە حزبی گەل وێرای ئەمانەش ململانێی نێوانیان بەهۆی لایەنی ئابوری کاریگەرییەکی ڕووکەش بوو... لەبەر ئەوەی حزبی

(توریز) نوێنەری چینی ئورستوکراتیەت بوو حزبی(ویکز) یش نوێنەری چینی بۆرژوازی بەریتانیا بوو...

حزبە پارێزگارەکان لەگەڵ دەرکەوتنی پەرلەمان سەریان هەڵدا هەردوو حزبەکەش دووچاری چەند گۆرانکارییەك هاتن (توریز) ئێستاپێی دەوترێت (حزبی پارێزگاران) (ویکز) پێی دەوترێت (حزبی ئازادیخوازان) .. سەرەرای ئەمانەش ئەم حزبانە لەهەندێك سیفەت ونیشانەدا هاوبەشن بەهۆی ئەوەی بایەخ و گرنگیەکی زۆر بەدەستەیەکی دیاری کۆمەڵ دەدەن ئەوانەی شوێێنێکی بەرزیان لەنێو کۆمەڵدا هەیە و خاوەنی سامانێکی زۆرن و سەر بەچینێکی کۆمەڵایەتی بڵندن دەتوانین بەم حزبانە بڵێین (حزبی چەند کەسانێك) بەهۆیەوە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ جەماوەر نییە و جگە لەمەش خاوەنی هیچ ئایدیۆلۆژیەکی دیار نینە و رێگای پەیوەندی کردنی نێوان رێکخستنەکانیان بەهۆی لێژنەکانەوە دێتە دی هەروەها بودجەی ئەم حزبانە لەرێگای چەند ئەندامێکی باڵای دەوڵەمەند کۆدەکرێتەوە . چالاکییەکانی ئەم حزبانە بەشێوەیەکی بەردەوام نیە، بەڵکو وەرزییە و پەیوەستە بەگێروگرفتەکانی سیاسی و ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان ، ئەندامەکانی بەهۆی بەرژەوەندییەوە یەك دەگرنەوە نەك ئادلۆژیەت ، چونکە ئەم حزبان ئایدیۆلۆژیەتیان تیانییە و کاریگەری بنەماڵەکانیشیان بەسەرەوە دیارە، هەر بنەماڵەیەك هەستی بەوەکرد کە پارێزگارە ئەوا دەچێتە نێو ئەم حزبانە دیاردەی کۆن ولاسایی کردنەوە

کارێکی توند لەنێو پێکهاتەی ئەم حزبانە پێکدەهێنێت .سیستەمی حزبە بەریتانییەکان رۆڵێکی بەرچاو دەگێرێت لەژیانی سیاس یئەم وڵاتە ، ناکرێت لەرژێمی سیاسی بەریتانیا بکۆڵێتەوە بێ لێکۆڵینەوەی سیستەمی حزبەکانی لەبەر ئەمەش لەنێو زاناکان و پشپۆرانی سیاسی بەرژێمی دوو حزبەکە ناسراوە... هەردوو حزبی پارێزگاران و ئازادیخوازان لەبەریتانیا دوو جەمسەری ململانێی سیاسی نیشان دەدەن ن بەڵام ئێستا حزبی کرێکاران شوێنی ئازادیخوازانی گرتۆتەوەو بۆتە لایەنی دووەم لەگەڵ حزبی پارێزگاران لەژیانی سیاسیدا...

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێت کە حزبی کرێکاران لەسەر بناغەی چەند گروپێك و کۆمەڵەی پەرلەمانی بەدیارنەکەتووە ، بەڵکو پەیدابوونی لەئەنجامی بزوتنەوەیەکی میللی کرێکاران بووە دوای شۆڕشی پیشەسازی حزبی کرێکاران لەبەریتانیا لەساڵی (١٩٠٠) لەرێگای پێکهاتنێکی ناراستەوخۆ سەری هەڵداوە.

## ڕۆڵی کۆمەڵە نهێنیەکان و هزریەکان وسەندیکاکان لەپێك هێنانی پارتە سیاسیەکان

بێگومان کۆمەڵە نهێنیەکان و هزریەکان رۆڵێکی بەرچاویان گێراوە لەپێکهێنان و بەدیار کەوتنی پارتە سیاسیەکان ، کۆمەڵەی (فابی) وەك کۆمەڵەیەکی هزری رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەپێکهێنانی پارتی کرێکارانی بەریتانی ، کۆمەڵەی فابی لەساڵی ١٨٨٤ لەئینگلتەرا دامەزراوە ناوەکەشی بۆ سەرکردەیەکی رۆمان (فابیوس) ی سەدەی سێیەمی پێش زایین دەگەرێتەوە بەپلانی چاوەڕوانی و دورکەوتنەوە ئەگەر بکرێت لەرووبەرووبونەوە لەگەڵ دوژمنان نێو بانگی دەرکردووە، لەسەرکردەکانی ئەم کۆمەڵەیە برناردتۆو سدنی ریب و گەلێکی تر... هەروەها سەندیکانی پیشەیش جێی پەنجەیان لەپێکهێنانی پارتی کرێکارانی بەریتانیا هەبووە، بەڵام سەدیکاکانی جوتیاران و هەرەوەزییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە لەبەدیار کەوتنی پارتە سیاسییەکان و دروست بوونی پارتەکانی جوتیاران لەدەوڵەتەکانی ئەسکەندەنافیاو ئەوروپای ناوەڕاست و کەنداو ئوستورالیا. جگە لەوەش ئایین کارگەری خۆی لەم بوارەدا نواندووە لەکاتی بەدیار کەوتنی بیرو باوەری(کالفینی) لەئەوروپا، پارتێکی سیاسی سەری هەڵدا بۆ بەرەنگار بوونەوەی پارتی پارێزگارنی کاسۆلیکی ، پرۆتستانەکانیش پارتێکی سیاسیان دامەزراندبۆ رووبەروو بوونەوەی کاسۆلیکەکان و هەڵگری بیرو باوەڕی (کالفینی).

وێڕای ئەمانەش بیرو باوەری ئایینی کارێکی زۆری کردە سەر پەیدابوونی پارتە سیاسیەکان لەکۆتایی و پاش سەردەمی خەلیفەکانی ئیسلامی هەروەها رۆڵی کۆمەڵی برایانی موسڵمانەکان شوێنێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوە داگیر دەکات کۆمەڵەی جەنگاوەرە کۆنەکان گاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر لەدایك بوونی پارتەکانی فاشی و نازی لەبەریتانیاو ئەڵمانیا، هەر لەم ڕوانگەیەوە لەفەرەنساو لەسالچی ١٩٦٣پارتێکی سیاسی پەیدابوو بەناوی (پارتی سۆشیالستی فەرەنسی) لەبنەڕەتدا ئەم پارتە کۆمەڵێك بوون لەجەنگاوەرە کۆنەکان.

لێرەدا خاڵێکی گرنگ دێتە نێو باسەکە کەپەیوەستە بەکۆمەڵەکانی نهێنی کۆمەڵەکانی نهێنی بەگرنگترین کاریگەر دەژمێردرێن بۆ پێکهێنانی پارتەسیاسیەکان چونکە زۆرجاران رێکخراو و کۆمەڵە نهێنیەکان بەگوێرەی یاسا رێگایان پێنادرێت بەئاشکرا کاربکەن لەبەر ئەوە پەنا دەبەنە بەر کاری نهێنی بۆ جێ بەجێچ کردنی ئامانجەکانیان وەك رووخاندنی دەسەلاتی رژێمێکی سیاسی یاخوود هەڵگیرساندنی بلێسەی شۆرشیچك دژی دەسەلاتی بێگانە ، بۆ نموونە پارتی بەرەی رزگاریخوازی جەزائیری نموونەیەکی بەرچاوی کۆمەڵەیەکی نهێنیەکە ئاگری شۆڕشکی هەڵگیرساند تابەدی هێنانی سەربەخۆیی ولات بەهۆی کردارەکانی ئەم کۆمەڵەیە و کارە شۆرشگێرییەکانی... پاشان وەك پارتێکی سیاسی هاتە نێو گۆرەپانی سیاسی. ئەو هۆیانە چین کە دەبنە

دواکەوتنی پەیدابوونی سیستەمی حزبایەتی ؟ پرۆفیسۆر (ماکیفەر) لەوەلاٌمدا دەلێت:-

ئەو هۆیانە دەگەرێنەوە بۆ مۆرکی تایبەتی چینایەتی ئەو ولاٌتانەی دیموکراتیان تێدا سەر هەلٌداوە ئەوەشیان زۆر بەزەقی بەر لەپێکەوتنی دیموکراتی بەدیار دەکەوت پێش قۆناغی دیموکراتیەت بەرژەوەندییە چینایەتییەکان بەسەر هەموو بوارەکانی کارکردن زالٌن ، لێرەدا هێزی بەرهەلٌستکاران روو لەزیادبوون دەکەن بۆ لاوازکردنی چینی فەرمانڕەوا بەمەش بوونی رێکخراوی حزبی زۆر زەحمەت دەبێت چونکە چینایەتی بەسەر هەموو شتێکدا زالٌە ، لەبەر ئەوە کاری رێکخراو گەشە ناکات تا بەتەواوی جیاوازی لەنێوان چینەکان و پارتەکان ئاشکرا نەبێت .

## كورتەباسێك دەربارەی رای گشتی

رای گشتی دیاردەیەکی سیاسی کۆنەو لایەنێکی جموجۆلی کاریگەری کۆمەڵگا بەسەر بارودۆخی ژیانی سیاسی رژێمەکان بەدیار دەخا ، لێرەدا لاپەرەکانی مێژوو هەڵ دەدەینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئەم کردارە چۆن سەری هەڵداوە و گەیشتۆتە ئەم بارەی ئێستا. رای گشتی لای کۆمەڵگا سەرەتاییەکان و هۆزەکان بوونی هەر نەبووە لەبەر ئەوەی ئەمانە پابەندی داب و نەریتەکانی خۆیان بووینە، بەڵام لەهەمان کاتدا شارستانیە کۆنەکان شیچوازی تریان هەبووە کە لەزۆر لایەنەوە نزیك بووە لەرای گشتی ... لەمانە میسریەکان و ئاشووریەکان ، ئەمەش لەکاتی جێ بەجێکردنی ئەرکەکانی پەرستگاکان بەدیار دەکەوێ، یاخود ئەوەی لەسەر تابلۆ بەردییەکان نوسراوەتەوە ، هەروەها هەندێ لەئایین و فەلسەفە کۆنەکان ئاماژەیان بۆ ئەم دیاردەیە کردووە و زاراوەی جۆراوجۆریان بەکار هێناوە لەوانە(دەنگی گەل) و(رۆحی گەل) هەر بۆنموونە: فەلسەفەی (کۆنفۆشیۆس) زۆر گرنگی بەم بوارە داوەو(کۆنفۆشیۆس) دەڵێ :- (ئاسمان لەرێگای گەلەوە سەیری خوارەوە دەکاو ئاسمان گوێی لێ یەو لەرێگای گوێیەکانی گەلەوە گوێ بیست دەبێ) . رای گشتی لای یۆنانییەکان رۆلێکی بەرچاوی دەگێرا بەتایبەتی لەنووسینی فەیلەسووفەکانیان وەك ئەرستۆ و ئەفلاتون و ئەوانی تر، خۆیان دەنواندو زاراوەی (هەلۆیستی خەڵك) و(رای گەل) (توانای نەتەوە) . لەوکاتەدا هاتنە کایەوە ئەمەشیان کاریگەری

راستەوخۆی لەکاتی کۆبونەوەکان و گفتوگۆکانی سەبارە بەبارودۆخی سیاسی ئەوسای وڵات نیشان دەدا لەمەڕ راگەیاندنی شەڕو هەندێ بریاری کۆمەڵایەتی، هەر ئەمانەش زەمینەیان خۆش کرد بۆ کارتێکردنی ڕۆڵی تاکەکەسی لەکۆمەڵگاو دیدو بۆچوونی بەرانبەر کردەوەکانی دەوڵەت، بەڵام رۆمانەکان بایەخێکی ئەوتۆیان بەخەڵك نەدەدا کەچی دوای هەر هێرشێك و داگیرکردنی وڵاتێك جۆرە نزیك بوونەوەیەك دەربارەی ژیانی ئابوری و باری سیاسی و خوو ڕەوشتی کۆمەڵایەتیان دروست دەبوو و هەواڵی تازە لەنێو خەڵکان بڵاودەبۆوە، بێ گومان ئەمەشیان کاری دەکردە سەر بیری رای گشتی دوای ئەمانە لەسەدەکانی ناوەڕاست جیهانی ئیسلامی و مەسیحیەکان گرنگیان بەرای گشتی دەدا بۆ نموونە : خەلیفەکانی ئیسلامی بایەخیان بەڕاو بۆچوونە جیاوازەکانی خەڵك دەدا ، جیهانی مەسیحیەکانیش جۆرە چەمکێکی لەنێودا باو بوو ، کەپێ یان دەگۆت(رێکەوتنی گشتی) کەکاریگەری خۆی بەسەر باری ژیانی ئەوسای کۆمەڵایەتیەوە دیاربوو. پاشان نووسەرە ناودارەکانی وەك میکاڤیلی و شەکسپیر جەختیان لەسەر رۆڵی رای خەڵك دەکرد(میکاڤیلی) کاریگەری رای گشتی زۆر بەزەقی لەنووسینەکانیدا شەکسپیریش لەشانۆکانیدا بەدیار کەوتووە.ئیدی لەسەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم هێزی رای جەماوەر زۆر بەئاشکرا لەنووسینەکانی (باسکال) و (ڤۆلتێر) و(هۆبس) و(لۆکە) خۆی نیشان دەدا، لەم ماوەیەدا هەندێ گۆرانکاری بوونەرێ خۆشکەری

پێشکەوتنی رای گشتی و کارکردنی بەسەر رژێمە سیاسیەکان، لەوانە بەدیار کەوتنی چاپ شۆرشێکی گەورەی نایەوە بۆ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی جیاجیاو فراوانبونی بواری خوێندەواری . هەروەها بزوتنەوەی چاکسازی یرۆتستانتی هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر دام و دەزگای کەنیسەی کاسۆلیکیەکان لەمەڕ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ئایینی بەشێوازێکی تازە، جگە لەمانەش سەردەمی راپەرین یان رێنسانس دەروازەیەکی چاکی بەرامبەر مرۆڤ کردەوە لەبوارەکانی ئابوری و سیاسی و ژیانی کۆمەڵایەتی پێش کەوتنەکانی ئابوری هەلێکی رەخساند بۆ بەدیار کەوتنیچینی بازرگانەکان هاندەرێکیش بوو بۆ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی تازە ئەویش لەرێگای گەشەپێدان و دەرچوونی رۆژنامەو گۆڤارو چەند کتێبێکی بەناوبانگ.

نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی (جان جاك روسۆ) رۆڵێکی بەرچاوی لەپێش کەوتنی بەکارهێنانی رای گشتی گێرا، نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ زاراوەی (رای گشتی) بۆ یەکەم جار لەسەرتای سەدەی دوانزەهەم لەلایەن سیاسەتمەدارو نووسەری ئینگلیزی (جۆن سالز بوری) بەکارهاتووە.گومانیشی تێدانیە شۆڕشی فەرەنسی ساڵی (١٧٨٩) بیروباوەرێکی نوێ ی بۆ ئەم جیهانە هێنا و جەختیشی لەسەر ئەوە کرد گەل دەبێ بریاری خۆی بدا ، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی گفتوگۆیەکی زۆر ئەنجام بدرێ دەربارەی رای گشتی لەئەڵمانیاو بەریتانیا لەسەدەی نۆزدەهەم و کاتی بەرپابوونی شۆڕشی پیشەازی

ئینگلیزەکان بایەخێکی بیٚ سنوریان بەرای گشتی داو لایان وابوو بناغەیەکی پتەو دژی کرداریستەم وزۆرداری پیٚك دەهیٚنیٚ.

ئەمەو گۆرانکاریەکی زۆرو پیچش کەوتنیٚکی مەزن لەبوارە جۆراو جۆرەکانی ژیانی مرۆڤ سەری هەلّدا ئیٚستاش سەدەی بیستەم چی نەماوە کۆتایی بیٚت (رای گشتی ) وەکو هیٚزیٚکی سیاسی گرنگ رۆلّی خۆی دەگیٚریٚت و بنەمایەکی گەورە لەحوکمرانیەت پیٚك دەهیٚنیٚ بەتایبەتی لەرژیٚمە دیموکراتیەکان دا.

## گرێی ئۆدیب لەبورای سیاسەت

شیکردنەوەی بواری سیاسەت لەرێگای سایکلۆژیەوە لەجیهانی ئێستامان رووی لەفراوانی کردووەو بایەخێکی گەورەی پێ دەدرێت پەیوەندی بەزانستێکەوە هەیە کەپێی دەووترێت زانستی دەروونناسی سیاسی. گومانی تیا نییە سیستەمی شیکردنەوەی دەروونی بۆ دیاریکردنی دیاردەی سیاسی پێویستە بۆ ئەوەی بەقووڵی رەگ و ڕیشەی پێکهاتەی کەسایەتی مرۆڤ بەدیار بخات ئەم رەگ وریشەیە بۆ رۆژانی یەکەمی ژیانی منالّی دەگەرێتەوە یەکەم پەیوەندی منداڵ بەکۆمەڵگە بەهۆی باوك و دایکەوە دێتەدی، لەبەر ئەمە سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان منالّ و باوك و دایکی لەرێگای هەست نەکردنەوە کاردەکاتە سەر هەموو پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتیی بەتایبەتی ئەوەی پەیوەست بێت بەدەسەڵات.

فریدۆ لایەنگری باوك و (گرێی ئۆدیب) یان بۆ هەموو بوارەکانی ژیان دیاری کردووە، بەم شێوەیە شۆڕش و جەنگی ناوەخۆ و دژایەتی حزبایەتی و جیاوازی کەسایەتی تادەگتە سۆسیالیست و کۆمۆنیستی ئەمانە والێکدراونەتەوە کە هەموویان شۆڕشن دژی باوك. بەو مانایەی کە دەسەڵات سیفەتێکی باوکایەتییەو بناغەکەی بۆ هەست نەکردنی مرۆڤ دەگەرێتەوە دیمەنی دایك و باوك دەوێنێت جگە لەمەش هەموو بنەماکانی سیاسی و بیرو باوەڕەکانی پەیوەست بەدەسەڵات تا ئێستا ئاسەواری وایان پێوە دیارەکە سەر بەباوکن، بەم هۆیەوە منداڵ کەوتۆتە ژێر کاریگەری

نێوەندی خێزانیەکەی کەتیایدا دەژیت وباوك و دایکیشی دوو رۆڵی جیاواز لەپیچکهاتەی دەگێرن، باوك و دایك یەکەم کەسن کە بناغە بۆ ژیانی منداڵەکەیان دادەنێن جگە لەسەپاندنی ئەرکەکان فەرمانی قەدەغەکردنی هەندیَ کار دەردەکەن ئینجا هەڵوێستی بەرانبەر دەسەڵات دیاری دەکە.

ئالێرەدا ململانێیەك سەرهەڵدەدا کە رەگ و ریشەی بۆ سەرەتای ژیان دەگەرێتەوە مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەگرێی(باوك) دەستنیشانکراوە، هۆزەکان ئەوانەی لەسەرەتای مێژوو سەریان هەڵداوە لەیەك پیاو پێکهاتبوون ژمارەیك لەئافرەتان خزمەتیان دەکردن ئینجا ئەو هۆزانەی دوای ئەمانە بەدیار کەوتن لەکۆمەڵە پیاوێك پێکهاتبون کەچی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ ئافرەت هەبووە، بەڵام ئەوەی لەهەموویان بەتەمنتر ببوە چالاکییەکانی بەرێوە دەبرد کەچی ئەوانی دی رێگەیان لیَ گیرابوو یاخوود قەدەغەبوو پەیوەندی بەئافرەتی هۆزەکەوە بکەن بەهۆی خپ بوون یان چەپاندنی سێکسی ئارەزوو رووی لەململانێکردن کرد ململانێیەك بەشێوەیەکی گشتی دەیویست دەست بەسەر جیهانی دەرەوە دابگریچت، بەڵام هەندیَ جار ئەم ململانێیە لەنێو هۆزەکە تەشەنەی دەکردو ئارستەی بەرپرسی راستەوخۆ دەکرا لەئەنجامدا چەند کۆسپ و تەگەرەیەکی دەخستە سەر کۆمەڵەکە کەچی بەخۆی جیَ بەجێی نەکردو لێیان دەرباز دەبوو...

ئیدی مێژووی مرۆڤایەتی لەمانە جەنگ و شەڕو کوشتارو ململانێی بچووك و گەورە درێژخایەنی ئەم دیمەنە سەرەتاییە کەرق و کینەی پێوە دیاربووە بەرانبەر باوك یاخوود سەرۆك بۆ نموونە فیرعەونی میسر شۆڕش

دژی پیاوانی ئایینی لەسەردەمی ئاشووریەکان چونکە نوێنەری دەسەڵات بوون، هەروەها دژی فەرمانڕەواکانی ڕۆمان وپادشاکانی ئەوروپا ، ئەوانەی دەسەڵاتیان بەرێوە دەبرد بەناوی(مافی خودایی) .

لەسەردەمی تازەش ئەم رق و کینەیە دژی باوك لەم دیمەنە خۆی دەنوێنێت کە بەدەیان بزوتنەوەو راپەرین دژی دەسەڵاتدران بەرپا دەبن لەبەر ئەوەی ئەمانە نوێنەرایەتی دەسەڵات و بەرژەوەندییەکان دەکەن کە ئەوانی دی لێیان بیٚ بەشن و هەمیشە لەنێو کاری چەپاندن دەژین.

لەراستیدا راو بۆچوونی فرۆیدۆ لایەنگرانی دەبنە بەربەست لەبەردەم هەندێك دیاردەی کۆمەڵایەتی گرێی بوك لەنێو ئەم کۆمەڵگایانە سەرهەڵدەدا کەبنەماو بناغەی کۆمەڵایەتی و رەوشتیان زۆر توندو وشکە بەرانبەر بەمەش ئەم سیفەتانە لەو کۆمەڵگایانە کە رێگا بەئازادی سێکسی دەدەن بەهیچ شێوەیەك بەدیارناکەن.

سەرەڕای ئەمەش زۆربەی بیچ بەش بوون و کپ بوون بۆ سەرچاوەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی دەگەرێتەوە تیایدا هەندێك کەس سوود لەبەرژەوەندیەکان وەردەگرن و هەندێکی تریش لێی بێبەش دەبن. ئیدی رق و کینە دژی باوك بەتەنیا بۆ ئەوە نییە کە دایکەکەی کردۆتە موڵکی خۆی ، بەڵکو پەیوەستە بەلایەنی سێکسی و کۆمەڵایەتی و چەند کاریگەرییەکی تر ئەمەشیان شۆرشێکە سەرچاوەکەی هەست کردنە بەوەی کە مافەکانی خوراونیاخوود خپ بوونی خودە وەك نارەزاییەك. هەندێك زانا بەشۆڕشی مرۆڤی لەقەڵەم دەدەن لەپێناو گەڕانەوەی مافەکان.

## کاریگەری پێشکەوتنی ئابوری
## بۆ سەر ژیانی سیاسی

لەسەردەمی ( ئەرستۆ) وە تاکوو ئێستا تیۆرە جیاجیاکان لەسەر ئەوە کۆکن کە پەیوەندیەکی بەتیین لەنێوان ئاستی پێشکەوتنی ئابوری نێو کۆمەڵگەو پابەندبوونی بەدیموکراتیەوە هەیە، ولاّتە دەوڵەمەندەکان پەیڕەوی سیستەمی دیموکراتی دەکەن بەرانبەر بەمەش سیستەمی دیکتاتۆری زۆربەی کات ولاّتە هەژارەکانی گرتۆتەوە لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەپیچشکەوتنی پیشەسازی و بەکارهێنانی ئامرازی تەکنەلۆژیای تازە لەولاّتە پێشکەوتووەکان دەبنە هۆی زیاد بوونی سامانی نەتەوەیی بێگومان ئەمەش کاردەکاتە سەر داهاتی تاکە کەسی و جۆرە دەرفەتێك بۆ دیموکراتی دروست دەبێت هەر وەکوو لەم خالاّنەی خوارەوە خۆیان دەنوێنن:-

١-بەشداربوونی جەماوەر لەکرداری دروست کردنی بریار بەشێوازێکی دیموکراتی پێویست بەوە دەکات کە جەماوەر خاوەن ئاستی هۆشیاری کۆمەلاّیەتی و شارەزای رامیاری هەبێت، ناتوانرێت ئەم ئامانجە بێتەدی تاوەکو هەولّ نەدریّ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئەم خەڵکە ئەویش لەرێگەی پەروەردەو فێرکردن ئەمانەش پێویستیان بەپێشکەوتتنی لایەنی ئابوری هەیە لەپێناو هێنانەدی دەزگاکانی پەروەردەو فێرکردن و کردنەوەی زانکۆو بنکەکانی رۆشنبیری و شوێنەکانی بلاّوکردنەوە و چاپەمەنییەکان...هتد.

رژێمی دیموکراتی بەتایبەتی سیستەمی پەرلەمانی پشت بەژمارەیەکی گەورەی سیاسییەکان دەبەستیٚ ، ئەوانەی توانا و شارەزایی و رۆشنبیری رامیاریان هەیە، بێگومان ئەمانەش لەولاٚتێکدا دێنە بەرچاو کەخاوەن ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری بێت کەچی ولاٚتە هەژارەکان نەك بەتەنها کادیری ایٚهاتوو رۆشنبیری کەمیان تیایە، بەلٚچکو دەزگاکانی فێرکردن و رۆشنبیری رۆلێٚکی ئەوتۆ ناگێڕن، ئەگەر بێتوو بیانەوێت ئەمانە پەیڕەو بکەن، لەسەریەتی پارە و رێگاکانی جێبەجێکردنی بگرێتە بەر ئەمەشیان لەتوانای ئەواندا نی یە. بوونی ئەم دەزگایانە کەهەماهەنگی لەنێوان گەل و دەولٚەت دروست دەکەن و رۆلێکی گرنگ لەژیانی رامیاری دەبینیٚ بەیەکێك لەنیشانە سەرەکییەکان دەژمێردریٚ کە ولاٚتە پێشکەوتووەکان لەولاٚتە هەژارەکان جیادەکاتەوە، ئەم دەزگایانەش بەرۆژێك و دوو رۆژ سەر هەلٚنادەن، بەلٚکو بەرهەمی پێشکەوتنی گشتی کۆمەلٚگە و کارێکی مێژوویی درێژخایەنی ژیانی رامیارییە.

٢-بریارەکانی سیاسی کەپەیوەندیان بەبەرێوەبردنی کاروباری گشتی هەیە لەسەر بناغەی رێکەوتنی نێوان کۆمەلٚگاو هێزەکانی رامیاری لەدایك دەبن، کەچی کۆمەلٚگایەکی دابەشکراو بۆ خەلٚکانێکی زۆری هەژارو کەمایەتییەکی خۆش گوزەران کارێکی سەختە. بەشێوەیەکی گشتی کۆمەلٚە خەلٚکێکی کەم دەسەلاٚت دەگرنە ئەستۆ، بەمەش فەرمانڕەوایەتی دیکتاتۆری دێتەدی بێگومان دابەشکردنی سامان

کارێکی گەورە دەکاتە سەر ژیانی چین و توێژەکانی کۆمەڵایەتی، بەمەش چالاکی رامیاری بەگوێرەی دەسەڵاتی هەر کۆمەڵگایەك یاخود چینێك لەنێو کۆمەڵگە بەدیار دەکەوێت.

٣-زۆربوونی بەرهەم هیوا دەبەخشێتە خەڵکانێك سودو قازانج لەخۆش گوزەرانی گشتی نێو وڵات وەربگرن. لێرەدا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەرو شێوازێك دەڕوات کەچین و توێژەکانی هەژاری نێو کۆمەڵگە هەست بەوە دەکەن کەتوانایان هەیە شوێنی گونجاو لەپلەو پایەی کۆمەڵایەتی بەدەست بهێنن. ئیدی قەبارەو چەندایەتی سامانی سروشتی دەبێتە هۆیەکی گرنگ و کاریگەر بۆ رێکخستن و لێك نزیك بوونەوەی بەشەکانی کۆمەڵگە لەرژێمەکانی لیبرالی.

(جۆرج بۆردۆ) ی مامۆستای زانکۆ رای وایە(تەشەنەکردنی دیاردەی دەوڵەمەندی وا لەمرۆڤ دەکات کەپێویستی بەدەسەڵات نەمێنێ) ئەو کاتی داهاتی نەتەوەیی زیاد دەکات رێژەی کرینی کەل و پەل و وئامرازەکانی ژیان لەلایەن خەڵك فراوانتر دەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەوڵاتە دەوڵەمەندەکان ژمارەی ئەو کەسانە زیاد دەکات ئەوانەی روو لە کرینی خانووی تازەو ئۆتۆمۆبیل...هتد دەکەن.

لەهەمان کاتیش ژمارەی ئەو کەسان زیاد دەکات کە لەزانکۆ دەخوێنن، بەڵام لەوڵاتە تازە پێگەیشتووەکان جیاوازی چینایەتی مانای جیاوازی نێوان هەر چینێك دەگەیەنێ ، کەدەسەڵاتی بەسەر زۆر کاردا هەیە. وێرای ئەمەش جیاوازی ئاستی کۆمەڵایەتی لەوڵاتە تازە

پێگەیشتووەکان بۆ سەر بنەما سەرەکییەکانی هەر چینێك ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە، چینەکانی دەوڵەمەند بەچاوێکی سووك و پڕ لەڕپ و کینە سەیری چینەکانی هەژار دەکەن، لەبەر ئەوەی شێوازی هەر یەکەیان بۆ ژیان جیاوازی هەیە، و کاردەکاتە سەر لایەنی سایکۆلۆژییان. لەبواری بەشداربوونی چینەکانی هەژار لەمافەکانی رامیاری بەتایبەتیش لەدەسەڵاتی رامیاری چینەکانی دەوڵەمەند پێیان وایە کارێکی نابەجێ و نەگونجاوە، بەمەش توندوتیژترین ڕێگا بەکار دەهێنن بۆ سەرکۆنەکردنی هەر بزوتنەوەیەك کە چینەکانی هەژار هەوڵی بۆ بدەن لەمەڕ بەشداربوانیان لەفەرمانڕەوایەتی . جگە لەمانەش داهاتی نەتەوەیی کاردەکاتە سەر پرۆسەی دیموکراتی ئەگەر بێتوو وڵات دەوڵەمەند بێ و دەسەڵاتداران مکوڕ نابن بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە ئەستۆ، لەبەر ئەوەی لەکاتی گواستنەوەی دەسەڵات بۆ چەند کەسانێکی تر کەسانی پێشوو ئاستی بەرزی ژیانیان لە دەست ناچێت ئەگەر لەدەسەڵاتیش نەمێننەوە. بەڵام لەوڵاتە تازە پێگەیشتوەکان گەیشتن بەسەرچاوەی دەسەڵات مانای وایە لە هەمان کاتیش ئاستی بەرزی ژیانیان دابین کراوە، ئەو کاتەی لەدەسەڵاتیش نامێننەوە هەموو شتێکیان لەدەست دەچێت لەبەر ئەم هۆیە هەموو هەولێك دەدەن بۆ ئەوەی لەدەسەڵاتدا بمێننەوە.

لەکۆتاییدا دیاردەی کۆکردنەوەی سامان لەلایەن دەسەڵاتدران لەوڵاتانی جیهانی سێییەم کارێکی روون و ئاشکرایە، زۆربەی هەرە

زۆری پیاوانی دەسەڵاتدار خاوەن سامانێکی گەورەن چ لەناوەخۆ یاخود لەدەرەوەی وڵاتدا بەرانبەر بەمەش زۆربەی چین و توویژەکانی تری کۆمەڵگە لەنێو هەژاری و برسیەتیدا دەژین.

تائێستاش ئەم دیاردەیە لەزیادبووندایە و چارەسەرییەکی گونجاوی بۆ نەکراوە — ئاخۆ دەبێ رۆژێك دابێ زۆربەی چینەکانی کۆمەڵگا تا رادەیەك وەك یەك بژین؟ یاخود چینەکانی هەژار بگەنە ئەو ئاستەی کە خەون و ئومێدیان بێتە دی؟

# پەیوەندی نێوان پێشکەوتنی زانستی و گەشەسەندنی رۆشنبیری

بەشێوەیکی گشتی پێشکەوتنی زانستی شوێنەوارێکی زۆر بۆ گۆرانکاریەکانی کۆمەڵگەی رۆشنبیری دەرەخسێنێ پێشکەوتنی ئامێر واتای پێشکەوتنی لایەنی پەروەردەو فێرکردن دەگەیەنێ جگە لەمەش زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە دەگرێتەوە لەهەمان کاتیش کاری کردە سەر ئەوەی کە ئەم خەڵکانە هەولّی بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی چاکتر بدەن کە جیاوازی هەبێت لەگەڵ کۆمەڵگای پێشوو . دەزگاکانی راگەیاندنی تازە وەکو رۆژنامەو ئێزگە و تەلەفزیۆن و پەرتووك نەك بەتەنها بوارەکانی رۆشنبیری فراوانتر کرد ، بەڵکو بوونە هۆی بایەخ پێدان و هێنانەدی لایەنی رەسەنایەتی ، لەکۆمەڵگاکانی پێشکەوتوو هەموو کەسێك توانای هەیە یەرچاوەکانی رۆشنبیری جیاواز لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوەدا بەدەست بهێنێ بەپێچەوانەی کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم ئەم سەرچاوانە خەڵکانێکی کەم سوودیان لێ وەردەگرن.

پێشکەوتنی زانستی دەبێتە هۆیەکی سەرەکی بۆ نزیك بوونەوەی پەیوەندی نێوان تاکە کەس و کۆمەڵگاە بەمەش ئەو خەڵکانەی لەناوچە دوورەکان دوورە پەرێزن بەیەکتر دەبەستێتەوە ، لێرەدا لەدنیای رامان و بیرکردنەوەی تەسك دەردەچن ئەمەشیان بێگومان دەبێتە هۆی دروستکردنی رێچکەی رەخنەگرتن و ئەو دونیایەی تیایدا دەژین دەکەوێتە بەر دادگایی کردنی بیرکردنەوە ، ئینجا پێشکەوتنی زانستی چەندین

ئلسۆی فراوانی بۆ مرۆڤ والآکردووە لەبەردەم بابەتەکانی رۆشنبیری و هێنانەدی دنیایەکی باشتر ، بەڵام لەلایەکی تر گیروگرفتی تازە سەری هەڵداوە لەبەر ئامرازەکانی رۆشنبیری بوونەتە پرۆژەی گەورەو لەتوانای تاکە کەسدا نین، بەم هۆیەوە تەلەفزیۆن و ئێزگە و رۆژنامە پرۆژەی ئابوری و رۆشنبیرین ـ لێرەدا مرۆڤ بەهۆی رێگەی رۆشنبیریەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری توندی دەزگە گەورەکان ئەمانەش لەرێگەی دەوڵەت یان حزب یاخود کۆمپانیا هەر دەزگایەکی تر بەریچوە دەچن.

رۆشنبیری لەکۆمەڵگای پیشەسازی لەدوو لایەنەوە گیروگرفتی هێناوەتەدی لەلایەك زاڵ بوونی بەرژەوەندیە گەورەکان بۆ سەر ئامرازەکانی رۆشنبیری خۆی دەنوێنێ لەلایەکی تریش مرۆڤ ئازادیەکی فراوانی بۆ نەرەخساوە بۆ ئەوەی گوزارشت لەبیروراکانی بکات.

هەندێ زانا توێژینەوەی ئەم دیاردەیەن بەپیشەسازی رۆشنبیری ناوزەدە کردووە، هەروەها پێیان وایە دیاردەیەکی گشتیەو پەیوەندیەکی بەتینی بەکۆمەڵگاە پیشەسازیەکانەوە هەیە سەرەرای جیاوازی رژێمە سیاسیەکان ، ئەم رۆشنبیریە لەبناغەوە ئاراستەی جەماوەر دەکرێت کەچی ئامانجی سەرەکیان ئەو مرۆڤەیە کەخاوەن رۆشنبیریەکی کەمە و تەمەنی ئەزموونی ژیانی کورتە بەمەش لایەنی قووڵی و رەسەنایەتی تیا بەدی ناکرێت چونکە بواری پیشەسازی و بیروکراتی باڵا دەستە.

لەراستیدا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەرچەندە لەزۆر لایەنەوە راستی پێکاوە بەڵام بیرکردنەوەیەکی رەشبینیەو هەمان هەڵوێستی کۆن بەرانبەر

پێشکەوتنی زانستی نیشان دەدا لەبەر ئەوەی ئامرازی رۆشنبیری تازە وێرای باڵا دەستی دەزگاکان لەمانە دەوڵەت ، حزب ، سەرمایەدار یان هەر دەستەیەکی تر توانیویانە ئازادییەکی فراوان لەبەردەم مرۆڤدا دروستبکەن لەپێناو دیاریکردنی ئارەزووەکان و هەلچبژاردنی ئەو کارانەی کەهەست دەکا لەخۆی نزیکەو لەگەلچ بیرکردنەوەی دەگونجێ. نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە دەزگاکانی کۆمەڵایەتی لەمانەش دەزگەی دەوڵەت لەسەر بناغەی چەند شێوازێکی کۆمەڵایەتی دروستکراوە، بەم هیەش لەکۆمەڵگای تازە بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤ ناکات، بەڵکو ئامرازەکانی تەکنەلۆژیای جۆراو جۆر دەبنە قەوارەی گشتی. لێرەدا مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی دەبێ ملکەچی ئەو لایەنە بێت کە بواری پیشەسازی تیایدا باڵا دەستە ئەم کردارەش لەهەموو رێکخراوەکانی رەسمی تا دەگاتە بچوکترین دەزگە جگە لەدەزگە کۆمەڵایەتییەکانی نارەسمی.

سەرەرای ئەمانەش مرۆڤ دوای ماوەی کارکردنی رۆانەی ناتوانێ کارگەری پێشکەوتنی زانستی لەخۆی دوور بخاتەوە وەکو سینەما و شانۆ و ئێزگە و تەلەفزیۆن و رۆژنامە، شۆرشی پیشەسازی چەندین گیروگرفتی هێناوەتەدی وەکو وزەی ئەتۆمی و چۆنیەتی کۆنترۆلکردنی ، هەروەها جیهانی بۆشاییگەری و گیروگرفتی سوود وەرگرتن لەسامانی ژێر دەریا و گەلێ گیرو گرفتی تازەی دیکە کە کارگەری زۆریان کردۆتە سەر ژیانی سیاسی نێو دەوڵەتی .

## پەیوەندی نێوان ڕێژەی دانیشتوان و
## بارودۆخی سیاسی

لەکۆنەوە زۆر لەنووسەران و فەیلەسووفانی وەك ئەرستۆ و مۆنتسکیوو رووسو بایەخیان بەپەیوەندی نێوان ژمارەی دانیشتوان و ژیانی سیاسی داوە هەر لەو کاتەدا بیرۆکەیەکی کۆنی بەربڵاو هەبوو ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە گوایە ئەو وڵاتانەی ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە زۆربەی کات شۆڕشیان تیا هەڵدەگیرسێ هەمیشەش تووشی کاری جەنگ دەبن لەگەڵ وڵاتانی تردا کەچی ئەو وڵاتانەی ژمارەی دانیشتوانیان کەمە تارادەیەکی زۆر باری سیاسیان سەقامگیرە، ئینجا زانای ئینگلیزی (مالسوس) ئەو راکۆنانەی کۆکردەوەو بەشێوەیەکی تر دایڕشتن لەتیۆرە بەناوبانگەکەی کە لەساڵی ١٧٩٨ نووسیبوی دیدو بۆچوونی لەم بارەیەوە خستە روو دەڵێ: ژمارەی دانیشتوان زیاد دەکات لەسەر شێوەی ئەندازەیی بەرانبەر بەمە بەروبوومی سروشتی زۆر کەمە و سنوری خۆی هەیە و زیادیش دەکات، بەڵام لەسەر شێوەی ژمارەیی ئیدی ئەم بەروبوومە بەشی ئەو خەڵکە زۆرە ناکات، کە هەمیشە لەزیادبوون دایە لەبەر ئەمە هەژاری بڵاودەبێتەوە هانیان دەدات بۆ بەرپابوونی شۆڕش و گۆرینی رژێمی کۆمەڵایەتی....

بەم جۆرە زۆر کەس لەسەر ئەم رایەن کە هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ و شەڕەکانی ناپلیۆن کە بەردەوام بوو لەساڵانی ١٧٩٢ تا ساڵی ١٨١٥ شی کردەوە جگە لەمانە زۆربوونی ژمارەی

دانیشتوانی ئەوروپا لەنێوان ساڵانی ١٨١٤-١٩١٤بووە هۆی بەرپابوونی چەندان شۆڕش و هەڵگیرسانی جەنگ لەم ماوەیەدا لەمانەش شەڕی جیهانی یەکەم ، هەمان سەرچاوە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە زیادبوونی دانیشتوانی ژاپۆن و ئەڵمانیا بووە هاندەرێك بۆ بەرپابوونی شەڕی جیهانی دووەم، هەر بەم تێڕوانینە و پێوەدانگەش شۆڕشەکانی جیهانی سێیەم دەخەنە ئەم قالبەوە .

لەراستیدا ئەم تیۆرە رەخنەو هەڵەیەکی زۆری لێگیرا لەبەر ئەوەی هەندێ وڵات هەنە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرەو لەهەمان کاتیشدا باری سیاسیان سەقامگیرەو چەمکی شەرانگێزی فراوانی نی یە بۆ ئەوەی ببێتە هۆیەك بۆ بەرپابوونی شەڕو ئاژاوە، هەروەکو وڵاتی هۆڵەندا بەرانبەر بەمە رووسیا ژمارەی دانیشتوانی کەم بوو ئەو کاتەی هەردوو شۆڕشی ساڵانی ١٩٠٥ و ١٩١٧ ی تیا هەڵگیرسا. هەر لەبەر ئەم هۆیانە تیوری(مالئۆس) پووچەڵ کرایەوە کەم کەس هەیە پاڵپشتی لێ بکات تەنیا هەندێ دام و دەزگای ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبێت. ژمارەی دانیشتوان زۆر جاران کاردەکاتە سەر پێك هێنان و یەکگرتنی کۆمەڵگەی سیاسی و بوونی کۆمەڵانی دانیشتوان کە جیاوازن لەبواری نەتەوەیی و ئایین و زمان، لەوانەشە ببێتە هاندەرێك بۆ ئەوەی دام و دەزگاکانی سیاسی سەقامگیری بن و کاربکەنە سەر ژیانی رۆژانەی سیاسیان ئەم دیاردەیەش لەولایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سویسراو بەریتانیا زۆر بەزەقی بەدیار دەکەون.

بەپێچەوانەوە لەهەندێ وولاٌتی تردا کەمینەیەك حوکم دەگرنە دەست و خۆیان دەسەپێننە سەر هەموو کاروبارەکانی ژیانی رۆژانەی شۆڕش و هاولاٌتیان ئەمەش دەبێتە هۆیەك بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش و کودەتاو ئاژاوە و پشێوی هەروەك لەولاٌتانی تازە پێگەیشتوو. لەلایەکی تر پەیوەندی نێوان دانیشتوان و هێزە سیاسیەکان لەتوانای هەموو رژێمێك دا هەیە بۆ ئەوەی هێزەکانی سیاسی ناو ولاٌت دیاری بکات، بەلاٌم لەسەر بنەمای زانستی و بەگوێرەی سەرژمێرێکی گشتی ژمارەی چینە کۆمەلاٌیەتییەکان دەستنیشان بکات ئەم کارەش بەشێوەیەکی تایبەتی کاتی هەڵبژاردن دەبێتە پێویستیەکی زۆر گرنگی لەپێشینەو بایەخ دار ئەو کاتەی هاولاٌتیان دەنگ دەدەنە حیزبە سیاسیە رکابەرەکان.

بێگومان پێویستە لێرەدا هێزە سیاسیەکان پێك هاتی دانیشتوان و تێڕوانینی ئەم خەڵکە زۆرەیان لەبەر چاو بێت وەك بابەتی رەگەزو تەمەن و کارەکانیان و شوێنی کۆلاٌتیەتیان و ئەو شویچنە جوگرافیەی تیایدا دابەش بوونە. لێرەدا شتێکی تریش دیچتە ناو ئەم باسە ئەویش رێژەی تەمەن درێژییە لەولاٌتە پێشکەوتووەکان ئەم رێژەیە زۆر بەرزە بەپێچەوانەی ولاٌتە دوواکەوتوەکان یاخوود تازە پێگەیشتوەکان ، لێکۆلینەوەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کەپیرەکان هەمیشە خۆیان دوور دەخەنەوە لەگۆڕانکاری و لایان پەسندە دام و دەزگاکان هەروەکو و خۆی بمێنێتەوە... بەلاٌم لاوەکان داوای گۆرانکاری و کرداری شۆڕش دەکەن لەبەر ئەمە زۆر لەنووسەران وولاٌتە پێشکەوتووەکان بەوولاٌتانی پارێزگار

ناو دەبەن کەچی وولاٌتە تازە پێگەیشتووەکان داخوازی گۆرانکاری بنەڕەتی دەکەن ئەم هۆیەش دەبێتە هاندەرێك بۆ ململانێی سیاسی توند لەشێوەی شۆڕش و کودەتای سەربازی.

زۆربەی سەرکردەکانی جیهانی ئەوانەی رابەرایەتی شۆڕشیان کردووە یاخوود بەردەوامن تەمەنیان لەسێ ساڵ تاوەکوو چلٌ ساڵ دەبێت ، لەبەر ئەم هۆکارانەی باس کران دانیشتوان رۆڵێکی تایبەتی هەیە لەلایەن هەر رژێمێك لەکاتی بریار دانی سیاسی و بەستراوەتەوە بەچەند بوارێکی تری ئەم بابەتە.

## کورتە باسێك دەربارەی مێژووی دەستوور

پێش هەموو شتێ ووشەی دەستور لەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی بەمانای دامەزراندن یان پێك هاتن دێ، بەلاّم لەبنەڕەتدا ووشەی دەستوور فارسی یە و ئاماژەیەکە بۆ حوکمڕانیەت دەست یەکێ لەئەندامەکانی لەش پێك دێنێ/ور/ ببەمانای خاوەن دێ . دەستور یەکێ لەبنەما گرنگەکانی فەلسەفەی رژێمە سیاسیەکانی ئێستایە لەرێگا دەستورەوە دەتوانین تارادەیەکی زۆر ناوەرۆکی رژێمەکانی سیاسی دیاربکەین ، هەموو وولاّتێك دەستوری خۆی رادەگەیەنێ هەر چەندە جیاوازییەك لەنێوانیاندا بەدی دەکرێ ، چونکە سەرچاوەکانی حوکم نیشان دەدا و پەیوەندی دەسەلاّت بەهاولاّتیان و ئەرکەکان و مافەکانیان تیادا نوسراوە، ئێستا لەهەموو جیهان ناسراوەو لەلایەن دەولّەتان وەکوو دیاردەیەکی ئاشکرا پەسند دەکرێ بەتایبەتی دوای بەرپابوونی هەردوو شۆڕشی ئەمەریکی و فەرەنسی لەکۆتایی سەدەی هەژدە، مێژووی سەرهەلّدانی دەستوورر بۆ یۆنانیەکان و شاری رۆما دەگەرێتەوە کە دەستێکی بالاّیان لەدەرچوونی و سەرەتای پەیدابوونیەوە هەبووەو وەکو بناغەیەك بەلاّم دوای چەند گۆرانکاریەك وپێش کەوتنی هەمەجۆر کەبەسەر ژیانی مرۆڤایەتی داهات دەستوریش دووچاری گۆرانکاری هات.

سەدەی هەژدەیەم بەسەدەی زێرین دادەنرێ لەبەر ئەوەی ئەم سەدەیە سەدەی بلاّوبوونەوەی بیروباوەڕی تازەو بەسەدەی گەشبین لەقەلّەم دەدرێ. چونکە دەرگایەکی والاّکردەوە بۆ ئەوەی تەنگو چەلّەمەکان بەرێگایەکی

گونجاو چارەسەر بكرێن دەستوریش وەك رێكخەرێكی پتەو بۆ جێ بەجێكردنی كاروباری دەسەڵات هاتە كایەوە بۆ جگە لەمەش بۆ ئەوەی مافەكانی هاوڵاتیان بپارێزێ. گومانی تێدانیە پەیدابوون و دانانی دەستوور لەلایەن رژێمە سیاسیەكانەوە جەخت لەسەر بوونی سەربەستی سیاسی و بیرورای ئازادی و لایەنەكانی دیموكراتیەت دەخاتە روو- هەرچەندە دەستوورەكانی هەندێ رژێمی سیاسی هەر بۆ تەنها خزمەتی تاكە كەسێك یاخود كەمینەیەك تەرخانكراو وەك دەستورەكانی ئەڵمانیای نازی و ئیتالیای فاشی، زۆربەی دەستورەكانی رژێمە سیاسیەكانی ولاتانی جیهانی سێ یەم ناوەرۆكی خۆیان وونكردووە لەمەڕ پەیوەندیەكانی نێوان دەسەڵاتداران و هاوڵاتیان و پابەندبوونی خۆیان بۆ جێبەجێكردنی فەرامۆش كردووە، تەنها خزمەتی مانەوەی دەسەڵاتی سیاسی دەكا.

لێرەدا پێویستە خالێكی گرنگ دەستنیشان بكرێ ئەویش ئەوەیە دەستوور پەیوەندیەكی تەواوی بەبارودۆخی كۆمەڵایەتی و ئابوری ئەو ولاتەوە هەیە كەرژێمە سیاسیەكەی دیاری دەكا. پاشان چەند هۆكارێكی گرنگ هەن رۆڵێكی تایبەت لەسەقامگیری و پتەوبوونی كرداری دەستوور دەگێڕن لێرەشدا ولاتانی ئەوروپی بەنموونە دەهێننەوە ، چونكە دەستووریان لەشێوەیەكی هەمیشەیی دایە. بارودۆخی جوگرافی و سیاسی و كۆمەڵایەتی ئەم ولاتانە هاتنە دی وەك ولاتانی نەتەوەیی لەسەر بنەمای شوێنی جوگرافیایی نزیك یەكتر ئەمەشیان كاردەكانە سەر ژیانی سیاسی ولاتان بۆ نموونە / ولاتانی ئەوروپی هەست بەبوونێكی نەتەوەیی

تەواو دەکەن لەبەر ئەوەی زۆربەی دانیشتوانیان لەیەکەوە نزیکن ئەم بارە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ وولایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هەیە کە لەچەندەها رەگەزی جیا جیا پێك هاتووە و کاردەکەنە سەر پێك هاتەی نەتەوەیی، هەروەها ولاتانی ئەوروپی لەرووی زمانەوانیەوە یەکەیەکی زمانی یەکگرتوویان هەیە تەنها سویسرا نەبێت کە چوار زمانی تێدا هاوبەشە ، جگە لەمانەش ژیان و گوزەرانی زۆربەی توێژەکانی کۆمەڵگاکان لەیەکتر دەچێ. خاڵێکی تریش ئەم ولاتانە لەیەکتر نزیك دەکاتەوە ئەویش مام ناوەندی ئاوو هەوایە کە کاریگەرییەکی تەواو دەکاتە سەر جوڵانەوەو کارکردنی هاولاتیان . لایەنێکی تریش هەیە ئەویش لایەنی رۆڵی ئاینیە ، ئاینی رەسمی لەئەوروپا مەسیحیەتە هەرچەندە ئاین ئێستا رۆلێکی ئەوتۆ ناگێرێ بەلام رێگای پرۆتستانیەت بەپێچەوانەی کاسۆلیکیەکان جەخت لەپەیوەندی نێوان تاکە کەس و خوای گەورە دەکا. بێ ئەوەی ناوبژیەك لەنێوانیاندا هەبێ لێرەدا شتێکی سەیر نیە زۆربەی دەستوری ولاتانی ئەوروپی دان بەمافەکانی تاکە کەسی دەنێن. جگە لەمانەش لایەنی رۆشنبیری کە پەیوەستە بەبلاوبوونەوەی خوێندەواری و هۆشیاری سیاسی خەڵکان بۆ ئەوەی داکۆکی لەمافە سیاسیەکانی خۆیان بکەن، ئیدی گەلێ هۆکاری تریش هەن رۆڵێکی گرنگ و بەبایەخ دەگێرن بۆ ئەو کەسانەی خەریکی دانانی بڕگەکانی دەستورن. دەستور دیاردەیەکی سیاسی شارستانیەو دیدو بۆچوونی فەلسەفەی رژێمە سیاسیەکانی تێدا بەدی دەکرێ

## سەرچاوەکان:


١- بلزاك و كۆمیدیای مرۆڤایەتی / گۆڤاری ( **دراسات عربية**) ژمارە / ١٢

٢- ئانا زیگر و دوو چیرۆكی زۆر كورت / گۆڤاری **الموقف الثقافي** ژمارە /٧

٣- الرآي العام / مناف النقيب

نظرية الري العام / د. حامد ربيع

٤- (تۆنی مۆریسۆن )ی رۆماننووس / الشرق الاوسط / ٧٠٦٠

٥- الرأي العام /المؤلفه/ مناف النقيب

٦-نشاة الاحزاب السياسية/ المؤلفة طارق الهاشمي ١٩٩٨/١/٩

٧- جان جاك رسو / العقد الاجتماعى

هانس كلسن/ الديمقراطية طبيعتها وقيمتها

گاستۆن بوتۆل/ علم الاجتماع السياسي

كراهام والاس / الطبيعة البشرية في السياسة

موريس دوفرجيه/ المدخل الى علم السياسة

جورج بوردو/ الديمقراطية

٨- نشاة الآحزاب السياسية / طارق الهاشمي

٩- علم الاجتماع السياسي/ المؤلفة: د.صاق الاسود

١٠- نشاة الاحزاب السياسية — د. طارق الهاشمي

علم الاجتماع السياسي – د.صادق الاسود
الديمقراطية طبيعتها وقيمتها- هانس كلسن
الامير الحديث - انگونيوگرامش
١١- نشاة الاحزاب السياسية – د. طارق الهاشمي ١٩٩٧/١١/١٧
١٢- الرأي العام/ كتابة:مناف النقيب ١٩٩٧/٧/٧
١٣- علم الاجتماع السياسي/ الدكتور صادق الاسود
النشاط الجنسي وصراع الطبقات / رايمون رايش : ترجمة محمود عيتاني/ دارالادب بيروت
نحو ثورة جديدة/ هربرت ماركوز : ترجمة عبداللطيف شرارة / دار العودة ١٩٧١
١٤- العالم الثالث: تأليف بيترو وسلي- ترجمة :حسام الخطيب – دمشق ١٩٦٨
في الدكتاتورية : موريس ديفرجيه: ترجمة : الدكتور هشام المتولي- منشورات عويدان –بيروت ١٩٦٥
١٥- المجتمع الصناعي / منشورات عويدات/ ريمون ارون بيروت ١٩٦٥
ج. مايكود التغير الاجتماعي والتنمية اليونسكو/ ترجمة :محمود فتحي عمر
١٦- خؤشةويستي لةئةمةريكا/ رؤذنامةي الشرق الاوسط / ذمارة / ٦٤٧٧

## ﴿كورتەیەك لەژیانی وەرگێڕ﴾

* لەساڵی (١٩٥٨) لەشاری هەولێر لەدایك بووە

* هەر لەم شارە خوێندنی سـەرەتایی و ناوەنـدی و دواناوەنـدی تـەواو کردوە.

* دەرچووی کۆلیژی یاسا و رامیاری زانکۆی بەغدایە لەساڵی(١٩٨٣)

* ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە

*ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە

* ماوەی شـانزە سـاڵە لـەبواری راگەیانـدن کاردەکـات و تائێسـتاش بەردەوامە

***************************

**کتێبە چاپکراوەکانی:**

**١- دەربارەی رۆمان – ساڵی ٢٠٠٦**

**٢- مەینەتیەکانی جیهانی نووسین – ساڵی ٢٠١٠**